# شەرحی

# مەتنی عەقیدەی نەسەفی

دانراوی

عمر نجم الدین النسفی

وەرگێرانی

عمر شێخ نورالدین مفتی

1428ز

2008ک

## ناسنامەی کتێب

ناوی کتێب : شەرحی مەتنی عەقیدەی نەسەفی

وەرگێڕانی : عمر شێخ نورالدین مفتی

شوێنی چاپ: چاپەمەنی گەنج

نۆبەتی چاپ: چاپی یەکەم

سەرپەرشتی چاپ : احمد حمە امین فتاح

تیراژ : ١٠٠٠ دانە

## ژمارەی سپاردن ٢٢٧ ساڵی ٢٠٠٧

به ناوی خوای گەورە

**سوپاس و ستایش بۆ پەروەردگار درووودی خوا لەسەر پێغەمبەر موحەممەد (درودی خودای لە سەر بێت) و ئالو بەیتی بە کۆمەڵ .**

رۆژێکیان ماموستا شێخ عومەری کوری ماموستای پێدەری بروانامەم ماموستا شیخ نورالدینی مفتی ﴿أطالَ الله بقائهما لخدمة الإسلام و المسلمين آمين﴾ ئەم کتێبە پیرۆزەی پێدام کە لێکدانەوەی (عقائد) ی نەسەفیە, تا چاومی پێدا بخشێنم هەر چەند لە خۆمدا شیاوی ئەوەش نیم , خوا جەزای نیازو کۆششەکەی بداتەوە و نوکی پێنوسی تیژ بێت بۆ سودی گشتی .

منیش بەماوەیەکی کەم خوێندمەوە . جەهدێکی باشی کردووە و ئەوەی پێویست بێ بۆ موسوڵمان بە دەقی ئایەتو فەرموودەی پەسندکراوی زانایانی ئاینی ئیسلام تیایدا دەست نیشانی کردووەو تەمی تاریکی تیادا نەهێلاوەتەوە بە بۆچونی خۆم , وەدەست نیشانی سەرچاوەو شوێنە کانیشی کردووەو پشتی بەبەڵگە بەهێزەکان بەستوە و ئامادەکراوە. هەموو خوێندەواریَ دەتوانیَ کەلکی لێوەربگریَ بەس عەمەل پێکردنی دەویَ بۆکەسی

مەبەستی بەختیاری بێت بۆ دوارۆژی لەبەردەم خوادا . خوا مەبەستە خێری یەکانمان بەئنجام بگەیەنێت .

والسلام على تابع الحق والهدى والحمد لله بدأ وختاما

محمود ملا محمەدی تاوگۆزی
پێش نوێژو وتاربێژی مزگەوتی
كاني ئاسكان-زرایەن-
٥/٥ /٢٠٠٣ زایینی

# بەناوی خوای گەورە

**سوپاس بۆ خودا سەلات و سەلام لەسەرگیانی پاکی گەورە و پێشەوامان حەزرەتی موحەممەد وئالو بەیت و شوێنی کەوتوانی تاقیامەت.**

خوێنەری بەرێز : لەبەر ئەوەی بیرو باوەڕ (عەقیدە) زۆر گرنگە لە ئاینی پاکی ئیسلامدا بۆ وەرگرتنی هەموو کردەوەیەکی چاك و دەزگیر بوونی ڕەزامەندی خودا , چونکە کردوەی چاك بە بێ عەقیدە ی دامەزراو بێ هودەیەی, خاوەنەکی ماندوبوونی بۆ دەمێنێتەوە .

بۆیە بە پێویستم زانی تەرجەمەی "متن العقیدةالنسفیة" ە ,بکەم چونگە بەراستی کتێبێکی زۆر نایاب و جوان و ڕێك و پێکە لە عەقیدەی ئەهلی سوونەو جەماعەتدا

وەئەم کتێبە یەکێکە لە کتێبە سەرەکیەکان کە لە حوجرە و مەدرەسەکاندا دەخوێنرێت .

هاتم لەسەرەوە لە هەموو پەرەیەکدا چەندێك بەر بکەوێت لە مەتنەکە نوسیومە, لەپاشا خەتم کێشاوە رستە رستە لە ژێر یدا مانام کردووە و بە گوێرەی پێویست ئایەت و حەدیث وفەرموودەی زاناکانم

بۆ هێناوە تا روون و ئاشكرا بێت . وەكتێبەكەم كردووەبەپێنج بەش و كۆتاییەك تاباسەكان جیا بن و زیاتر سود بەخش بێت

لەخودا داواكارم كە لەئێمەی وەرگرێت و بۆ ئێوەش سوود بەخش بێت.

وصلى الله على سيدنا محمد واله وصحبه وسلم

**عمر شـــيخ نورالدين مفـــتی**

**پێش نوێژ و وتار خوێنی**

**مزگەوتی دارالســـلام**

**هەڵەبجەی شەهید**

# بەشی یەکەم

## ئەم بابەتانەی لەخۆو گرتووە:

(١) پێشەکی

(٢) حەقیقەت و راستی شتەکان وریگای ناسنی

(٣) وەڵام دانەوەی پێچەوانەکان

(٤) هۆکاری زانیاری بەوشتانە .

## سەرەتایەك

**ئەحكامە شەرعیەكان دوو جۆرن:**

**یەكـــەم**:كـرداری(عملیــە)پەیوەنــدی هەیـە بەچـۆنیەتی كـرداری بەندەكانــەوە دووبـارە ناودەبرێــت بــە (فرعیـــة) و حوكمــەكان . وەك واجبیەت بۆ نوێژ وحەرامیەت بۆ زینا.

**دووەم**: باوەڕی (إعتقادیة):پەیوەندی بە باوەڕەوە هەیە , وەدووبارە ناودەبرێـت (أصـلیة) بنــچینەییە, وەنـاویش دەبرێـت ( علـم التوحیـد والصفات) زانیاری یەكتاپەرستی و سیفەتەكانی وەك باوەڕمان بەیـەكتا پەرستی خوا , وەبوونی رۆژی دوایی و فەرزیەتی ئەركانی ئیسلام [1]

**چ زانیاریەكە ؟**

ئەو زانیارییە كە پەیوەندی هەیە بە چەسپاندنی بیرو باوەڕی ئاینی یەوە ﴿العقائد الدینیة﴾ ئەمە باسە ئەم زانیاریە بەچی سەلمێنراوە؟

بە بەڵگەی ﴿النقلیە﴾ واتـە : ئەو بەلگانـەی كـە قورئان و سوننەتی پێغەمبەرە (دروودی خودای لە سەر بێت) , وەبەڵگەی عەقڵی .

مەسـئەلەكان: بریتیـە لـە چـەند كێشەیەك بـاس دەكـات لـەواجب و مـەحاڵ و لـەوەی دروسـتە لەحـەقی خـوداو پێغەمبـەران و چەسـپاندنی شتە پەنامەكیەكان ﴿المغیبات﴾

---

(١) شەرح العقائد ل :٥ شرح النسفیە فی العقیدە الاسلامیە ل :٧ .

مەبەستەکەی پێنج شتە:

یەکـەم: بەرزبوونـەوەو دوورکەوتنـەوە لـەنزمایی و نـشێوی چـاو لێگەری شوێن کەوتن بۆ بەرەو لوتکەیی بروای پتەوو نەلەقیو .

دووەم :ڕێپیشاندانی ئەوانەی دەیـەناوێ بکەونە سـەر ڕێ بـە ڕوون کردنـەوە و دەلیـل و بـۆردانی ئەوانـەی ئینگـار دەکـەن بەهێنانـەوەی دەلیلی پتەوی دەم کوتکەر .

سێیەم: پاراستنی پێرەوەکانی ئاینی ئیسلام لـە شـوبهە و گومـانی بێ باوەڕان .

چوارەم : دامەزراندن و بنیادنانی عیلمە پـەیرەوی یـەکان لەسـەری, چونکە عیلمی کەلام بناغەیە.

پێنجەم: ڕاستی و دروستی بیروباوەڕ [٢] .

---

(٢) عەقیدەی مرضیة ل:٨٥١ و ٨٥٢ وشرح النسفية ل:٨و٩ ..

## دانەری ئەم زانیاریە کێ یە؟

شێخ ئەبولحەسەنی ئەشعەری [٣] و ئەبو مەنصوری ماتوریدی یە [٤] لە بەر ئەوەی ناسراوترین کەسن لە دانانی ئەم زانیاریە وە لە بەڵگە هێنانەوەیان لەسەر پێچەوانەکان .

## بەڵگەکانی :

بەڵگەقەطعیەکانە کەزۆربەی کۆمەکی کارە بە بەڵگە بیستنەکان "السمعية"

## حوکمی شەرع چی یە تیایدا ؟

فەرزی عەینیە لەسەر هەموو موسوڵمانێك کە بەکورتی بیزانێت وەك ئەوەی کەباوەڕی ببێت بەبوونی خوداو فریشتەکان و......

---

(٣) ئەشعەری ناوی عەلی کوری ئیسماعیلەو کونیەی (ئەبوالحەسەن ) یەکێکە لە زانایانی (سەلەفی صالح) لە سالی (٢٦٠) ی کۆچی لەدایك بووە و لەسالی (٣٢٤)ی کۆچی دا وەفاتی کردووە , بەرگری ( عەقیدەی )ی ئیسلامی کردووە نەژادیشی دەچێتەوە سەر حەزرەتی (ئەبو موسای ئەشعەری ) کە یەکێکە لە هاوەڵ بەرێزەکانی پێغەمبەر (درودی خودای لە سەر بێت ) , لە پێشدا (معتزلە)بووە تۆبەی کردوە گەڕاوەتەوە سەر ڕاڕەوی (ئەهلی وسوننەت و جەماعەت) و لە لقەکانی ئاینیش دا هاتە سەر مەزهەبی( شافیعی) . روون کرنەوەی العقيدة الطحاوية ل:٥

(٤) ماتوریدی ناوی موحەممەدی کوری موحەممەد کوری مەحمودەو نازناوی (علم الهدى) و کونیەی (ئەبو مەنصور ) ٥ , لەگەرەکی ماتورید لەسەمەرقەند لەدایك بووە , سالی (٣٣٣) ی کۆچی هەر لە شاری سەمەر قەند کۆچی دوایی کردووە , ئەم زاتە زاناو گەورەیەش لە سەمەرقەندو دەورو پشتی دا ماندوونەناسانە هەوڵی دا بۆ برەو دان بە رێبازی ئەهلی سوننەت و جەماعەت . عەقیدەی مەرضیە ل :٥٢٨ .

فەرزی کیفایەیە زانینی بەبەڵگەی درێژ وەك ناسینی بوونی خودا بەهۆی پەیدابوونی جیهان و گۆڕانی پلەو پایەی لەنێوان زانیاریەکاندا .

بــەڕێزترین زانیاریــە لەبەرئــەوەی بنەچــەیە لــە زانیــاری ئاینــدا وەپەیوەندکارە بە زاتی خوداو پێغەمبەران .

**ناوەکانی ئەم زانستە :**

یەکـەم: ( علـم التوحيـد) بۆیـە نـاوبراوە بـە عیلمـی تەوحیـد لەبـەر ئـەوە بەناوبانگترین باس باسی یەکتا پەرستی یە کە بنەچەی ئاینی یە .

دووەم : ( علــم الكــلام ) نــاوبراوەپێی لەبەرئــەوە ناونیــشانی باسەکەی دەڵێن "الكلام في كذا وكذا " قسەکردن لەوەو لەوە دایە.

سێهەم :(علم العقائد) بەمەش ناوبراوە لەبەر ئەوە ئایین پێك هاتووە لە ( أصول و فروع ) ئوصول بیرو باوەڕەکانە نـاو دەبرێـت بـە "ا صـول الــدين " وفــروع ئــەو کــردارە عەمــەلی و خوورەوشــتانەیە کــە یەکــەم ناودەبرێت بە"علم الفقه" وە دووەم بە "علم التصوف" "[٥]

**هوکاری دانانی ئەم زانیاریە**

ئەم زانیاریە " سلف صالح" [٦] باسیان نە کردووە و هیچیشیان لـە بارەیەوە دانەناوە بە هۆی فەروو بەرەکەتی هاوڕێ یەتی پێغەمبەرەوە

---

(٥) (علم الفقه) (فقه) له زمانی عەرەبیدا : زانیاری یە بە و شتەو تێگەیشتن لێی . وە لـە زاراوەی زاناکان : زانیارییە بەو حوکمە شەرعیە کردارییانەیە کە وەربگیرێت لە بەڵگە شـەرعیە درێژەکان " تصوف" شـێخ مـەعروف کـەرخی دەفـەرموێت : تـصەووف پـەیڕەوی کردنـە لـە (حقائق ) گوێنەدانە بەوەی کە لە دەستی خەڵك دایە .

(٦) " سلف صالح " مەبەست بە زانیایانی سەدەی یەکەم دووم سێیەمە کـە پێغەمبـەر (درودی خودای لە سەر بێت) کە شاهیدی بـۆ داون و ئەفـەرموێت :" خَيرُ أمَّتي قَرني , ثمَّ الــذين

(درودی خودای لە سەر بێت ) نزیکیان بە زەمانیەوە , وەلەبەرکەمی رووداوو جیاوازی وەدەشیان تووانی بگەرێنەوە لە پرسیارەکان بۆ لای خاوەن باوەڕپێکراوەکان .

تا ئیسلام بلأوبویەوە (موالی) وتێکەڵ بووبە موسوڵمانان لەغەیری عەرەب وە گواستنەوەی فەلسەفەی ئەغریقی ومەنطقی یۆنانی بۆ کۆمەلگای ئیسلام لە سەردەمی ئەبو جەعفەری مەنصور لە پاشا لە سەردەمی هارونە رەشید کە دووەم خەلیفەی عەباسیەکان لەپاشا لەسەردەمی مەئموون ئەو زانیاریانە تەرجەمە کران بۆ عەربی .

کۆمەڵێ ئاشکرا بوون خەڵکیان بانگ دەکرد بۆ پەیدا کردنی شت لە بیر و باوەڕدا , وەبە ئارەزووی خۆیان باسیان دەکرد لێیەوە بەبێ ئەوەی بگونجێ لەگەل قاعیدەی ئیسلام و دەقی قورئان و سوننەتدا. وەك قسەکردن لە شوبهاندن و جیسم دانان بۆ خودا وە بەدانانی کۆنی (قەدیم) ی جیهان , وەنەفی کردنی ئەجسام و جگە ئەمانەش [٧] .

جا موعتەزیلە دەم کوتیان کردن و وەلأمیان دانەوە زۆر بەچاکی , لەمەدا خاوەنی شەرەف و رێزن هەرچەند ئەوانیش خاوەنی رای تایبەتین دەربارەی خوداو, پایەی خاوەنی گوناهی گەورە, بێدەسەلاتی و دەسەلات داری ئینسان لەکارو کردەوەی خۆیدا , یالە باسی ئەلفاظي

---

یلونهم ْ ثمَ الذین یلونهم" رواه البخاری ومسلم چاکترینی ئومەتم سەدەی خۆمە لە پاشان سەدەی دووام لە پاشان سەدەی دوای ئەوان . ئیمامی ئەوەوی قەطەلانی فەرموویانە مەبەست چینی ( صحابە ) و (تابعین ) و (تابع التابعین) ن .

(٧) — : شرح النسفیه ل : ١٠و١١ و١٢ . .

قورئاندا كه ئاخۆ دروست كراو ( مەخلوق ) ن يا خۆ قەديمين ..... تا دوايى .

ئەمانە دژى ئەهلى سوننەت و جەماعە تن وە بە ئەهلى بيدعەت ناسراون . دەربارەى هۆى ناونانيان بە موعتەزيلە دەڵێن :رۆژێك ( واصل) ى كورى ( عطا) مامۆستا و پێشەواى موعتەزيلە لە كۆڕێكى شێخ حەسەنى بەصريدا دانيشتووە , لەو كاتەدا زەلامێك خۆى دەكات ژووردا بە شێخ حەسەنى بەصرى دەڵێ : كۆمەڵێك پەيدابوون خاوەنى گوناهى گەورە بەكافر دادەنێن و گوناهى گەورەيان لا كوفرە .

كۆمەلێكيش دەڵێن : گوناهى گەورە لە گەڵ بوونى باوەڕدا زيانى نيە . ئا لەو كاتەدا كە شێخ حەسەنى بەصرى بيرى لە شتەكە دەكردەوە پێش ئەوەى قسەبكات , ( واصل) ووتى : من ناڵێم خاوەنى گوناهى گەورە كافرەو نايشڵێم موسوڵمانە , بەڵكو دەڵێم نە موسوڵمانەو نە كافر , پايەيەكى هەيە لە نێو دوو پايەى موسوڵمان و كافردا .. , ( إنَّ مُرْتِكب الكبيرةِ ليس مؤمناً ولا كافراً ـالمنزلة بين المنزلين ). ئەمەى ووت و هەلسايە سەر پێ و چوو پاڵى دا بەيەكێك لە كۆڵەكەكانى مزگەوتەوە و خەريكى تەقرێرى وەلامەكەى بوو .

شێخ حەسەنى بەصرى كە ئەمەى دى فەرمووى : "اعتزل عنَّا واصل.." واتە : واصل لێمان جيا بووەوە كەنارى گرت . لەو رۆژەوە واصل و پەيرەوەكانى ناونران( معتزله) واتە : كەنار گرتوو لەزۆر بەى زانيانى ئيسلامدا[٨].

---

(٨) ــ : عقيدي مرضية ل: ٨٥٣ . .

وەمەزهەبی موعتەزیل بلاو بوویەوە لە ناو خەڵکی دا تا شێخ أبو الحەسەنی ئەشعەری بە مامۆسا کەی ووت کە ئەبوو عەلی جوببائی بوو : تۆ چی دەڵێیت لە سێ براٰ دا یەکێکیان مردووە گوێ رایەڵی خودا بووە وە ئەوی تریان یاخی بووە لە فەرمانی خودا وەسێهەمیان بەمندالی مردووە , ووتی یەکەمیان پاداشت ئەدرێتەوە بەبەهەشت وەدووەمیان تۆڵەی لێ دەستێنرێ بەئاگر وە سێهەمیان نە پاداشت دەدرێتەوە نە تۆڵەی لێ دەستێنرێ .

ئەشعەری فەرمووی : ئەگەر سێهەمیان ووتی ئەی خودایە بۆچی منت بەمنداڵی کوشت بۆ نەتهێشتمەوە تا گەورە ببم و باوەڕ بێنم و گوێڕایەڵی بکەم بچم بۆ بەهەشت , ئەویش وەڵامی دایەوە ووتی خودا دەفەرموێ : من زانا تر بووم بە تۆ ئەگەر گەورەش بوویتایە بێ گوێیت دەکرد و دە رۆیشتیتە ناو دۆزەخەوە چاکتر وایە بۆ تۆ کەبە منداڵی بمریت .

شێخی ئەشعەری دەفەرمووێت : ئەگەر دووەمەکەیان ووتی : بۆچی منت بەمنداڵی نەکوشت تا بێ فەرمانی تۆنەکەم نەرۆمە ئاگرەوە خوا چی دەفەرمووێ : ئەبوو عەلی جوببائی بێ دەنگ بوو شێخ ئەبو الحەسەن بۆری داو وازی هێنا لەمەزهەبی جوببائی ئیتر خۆی و شوێن کەوتوانی سەرقاڵی بەرپەرچدانەوەی موعتەزیلەکان بوون[٩] .

---

(٩): شرح العقائد , ل: ٨ و٩ .

## قـالَ أهـلُ الحـق : حقـائقُ الأشـياءِ ثابتـةٌ والعلـمُ بهـا متحقـقٌ خلافاً للسُوفِسْطائِيَةِ

[ قـال أهـل الحـق : حقـائق الأشـياء ثابتـة ][11] ئـەهلی حـەق و ڕاسـتی واتـە: ئـەهلی سـوننەو جەماعـەت دەفـەرمون : حـەقیقـەت بـون و ڕاسـتی شـتەکان هـەیـە لـە دەرەوە . ووشـەی (حقـائق) کۆیـە و تاکـەکـەی "حقیقـة" ,حەقیقـەت بـوونی شـتە بـەوەوە هاتبێتـە جـیٚ وەك "الحیـوان الناطق" بۆ "الانسان" . ﴿ والعلم بها متحققٌ ﴾ زانیاری هاتووەتـە جـیٚ بـەو حەقیقەتانـەوە [خلافـا للسوفـسطائیة] بـە پێـچەوانە بـۆ سۆفەسطائیەکان ئینکاری بوونی شت دەکەن ودەلێن: ئەوەی دەبینرێ لـەو شـتانە حەقیقـەتی نیـە نـە لـەدەرەوە نـە لـە واقیعـدا بـەڵکو وەهـم وخەیالاتە .

وەلەناو خۆیاندان دەبن بەسیٚ کۆمەڵ : -

**کۆمەڵی یەکەم** : دەڵێن : بەڕاستی حەقیقەت و بوونی شتەکان وەهمو خـەیالاتی بەتالّـە ئـەو دیـوارەی ئێمـە دەیبینین کـە پێکهاتووە لـە بەردو گەچ بۆنمونە بوون و حەقیقەت بۆ پارچەکانی نیە بەڵکو وەهمێکە کەوتوەتە خەیالّی بینەرەوە ئەوانە پێیان دەڵێن "العنادیة" .

---

(١١): دانەری ئەم مەتنە ئیمام نەجمەدینی نەسەفی یە عومەری کوری موحەممەدی کوری ئەحمەدە زانا بە تەفسیرو ئەدەب و مێژوو بووە لە شەرع زانەکانی ئیمام حەنەفی بووە , لەساڵی (٤٧١ك–١٠٧٨ ز) لەنەسەف لە دایك بووە , لەساڵی ( ٥٦٠ك –١١٦٥ز) کۆچی دووایی کردووە لەسەمەر قەند , ووتراوە سەد کتێبی داناوە , ناو نراوە بە ( مفتي الثقلين) .
شرح النسفية ل : ٥.

**کۆمەڵی دووەم** : دەڵێن بەراستی حەقیقەتی ئەو شتانە ڕووی نەداوە بەڵکو حەقیقەتی ئەو شتانە شوێن کەوتەیە بۆ بیرو باوەڕیان . ئەگەر سەیری دیوارێکت کرد دەبینی کە پێك هاتووە لە بەرد و گەچ بۆ نموونە ئەوە بەگوێرەی بیرو باوەڕی خۆتە ، ئەوانە پێیان دەڵێن " العندية" چونکە دەڵێن ئەو شتە لە لای من وایە .

**کۆمەڵی سێیەم** : ئینکاری زانیاری دەکەن بەجێگیر بوونی حەقیقەت و ڕاستی یا جێگیر نەبوونی , دەڵێن ئێمە گومانمان هەیە لە و حەقیقەت و ڕاستی یە وە گومانمان هەیە دووبارە لە خۆماندا ئایا ئێمە گومانمان هەیە یان نا ؟ ئەوانە ناو براوون بە (اللاأدرية) لە بەر ئەوەی دەڵێن نازانین ئامانجیان نەهێشتنی باوەڕ بە خوداو ڕۆژی دوایی و حوکمە شەرعیەکانە شرح النسفية ل : ١٨ .

و أسبابُ العلمِ للخلقِ ثلاثةٌ الحواسُ السليمةُ , والخبرُ الصادقُ , والعقلُ فالحواسُ خمسٌ السمعُ والبصرُ و الشمُ, والذوقُ , واللمسُ ,وبكلِ حاسةٍ مِنها يُوقفُ على ما وضعتْ هي لهُ ، والخبرُ الصادقُ على نوعين : أحدهما - الخبرُ المتواترُ وهو الثابتُ على السنةِ قومٍ لا يُتصورُ تَواطُؤهم على الكذبِ , وهوَ موجبٌ للعلمِ الضروريّ كالعلمِ بالملوكِ الخاليةِ في الأزمنةِ الماضيةِ والبلدانِ النائيةِ .

---

[ وأسباب العلم للخلق ثلاثة ] هۆکاری زانیاری بۆ دروستکراوی خودا لە ئادەمیزادو پەری و فریشتە سیانە: [ الحواس السليمة , والخبر الصادق , العقل ] هەستی تەواوی بێگەرد و , هەواڵی ڕاست کە ڕێك بێت لە گەل واقیعدا و , عەقڵە . [ فالحواس خمس : السمع ,

والبـصر و الـشم , والـذوق, واللمـس ] هێـزی هەسـت کـردن پێنجـە بیستن , بینین , بۆن کردن , چەشتن , دەست لێدان .

[ وبكل حاسة منها يوقف علـى مـا وضـعت هـي لـه ] بەهەموو یەکێك لەو پێنج هەستیارە ئاگاداری پەیدا دەبێت بەهۆیەوە لەسەر ئەو شتەی دانراوە بۆی بۆنموونە : هەستی بیستن دروستکراوە بۆ ئەوەی ئاگاداربێـت بوەسـتێنرێت بەهۆیـەوە لەسـەر دەنگـەکان , وەهەسـتی چەشـتن بـۆ ئـەوەی ئاگاداربێـت و بوەسـتێنرێت بەهۆیـەوە لەسـەر خواردنـەکان , ناگونجێـت ئاگـادار بێـت بەسـەر رەنگەکانـدا بەهەسـتی بیستن وەلەسەر دەنگەکان بەهەستی بینین ، شرح النسفية ل: ٣٥ ..

[ والخبر الصادق على نوعين ﴾ هـەواڵی راسـت کـە رێك بێت لـە گـەل واقیعـدا لەسـەر دووجـۆرە : [ أحـدهما ـ الخبـر المتـواتر وهـو الثابت على ألِسنة قوم لايتصـور تُواطـؤُهُم علـى الكذب ] یـەکێکیان لەو دووانە هـەواڵی موتـەواتیرە ئەویش هـەواڵێکی سابتە لەسـەر زمـانی کۆمەڵێ کە عەقڵ بە رەوای نەزانێ رێـك کـەوتنیان لەسـەر درۆ ، ﴿ وهـو موجـب للعلـم الـضروري] وەهۆیـشە بـۆ زانیـاری ناچـاری [کـالعلم بالملوك الخالية في الآزمنة الماضية و البلدان النائيـة ﴾ وەك زانیاری بەو پاشایانەی ڕابووردوون لە زەمانی رابردوودا وەك هارونە ڕەشید وە ئـەو شـارە دوورانـە وەك مەککـە بەغـدا .... یـانی : خەبـەری (متـواتر) ئـادەمیزاد ناچـار دەکـات لەسـەر ئـەوەی بـاوەڕ بکـات کـە لـەزەمانی

رابـردوودا خەلیفـە هـەبووە لەبەغـداد نـاوی هارونـە ڕەشـید بـووە ... وەكەس ناتوانێ سەرپێچی بكات لەبوونیان .

والثانـي : خبرُ الرسـولِ المؤيـدِ بـالمعجزةِ وهـو يوجـبُ العلـمَ الاستدلالـيَ . والعلمُ الثابتُ يضاهي العلـمَ الثابـتَ بـالضرورةِ فـي التيقن والثباتِ . وأمَّا العقلُ فهو سببُ للعلمِ أيضاً. و ما ثبتَ منـهُ بالبداهَةِ فَهُوَ ضَروريٌّ ، كالعلمِ بأنَّ كلَّ شـيءٍ أعظمُ من جزئِـهِ ، و ما ثبـتَ بالإستِدْلال فهوَ إكتسابيٌّ . والإلـهامُ لـيسَ من أسـبابِ المعرفةِ بصـحةِ الشـيء عندَ أهلَ الحق .

---

﴿والثاني خبر الرسول المؤيد بالمعجزة] دووەم لە هەواڵی ڕاست هەواڵی پێغەمبەرەكە پشتگیری كراوە پەیامەكەی بە موعجیزە [ وهو يوجب العلم الإستدلالي﴾ هەواڵی پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) بە پێویست دەگێڕێ ئەو زانیاریە كە پەیدا دەبێت بە ڕوانین لە بەڵگەدا ﴿ والعلم الثابت به يضاهي العلم الثابت بالضرورة] وە ئەو زانیاریـەی بەهەواڵی پێغەمبەر(صلی الله علیه و سلم) پەیدا دەبێ دەشوبهێ بەو زانیاریـەی جێگیر بێ بە ناچاری وەك هەستە پێشوەكان ﴿ فـي التـيقن

والثبات ] لە نەبوونی ئیحتمالی هەڵوەشانەوە نەبوونی ئیحتمالی لاچونی گومان .

﴿ وأما العقل فهو سبب للعلم أيضاً] هۆیەکی تر لەهۆکانی بەدەست هێنانی زانیاری لەلای جومهوری موسوڵمانان عەقڵە دووبارە کە عەقڵ هێزێکی دەروونییە بە هۆی ئەو هێزەوە ئامادە دەبێت بۆ زانیاریەکان دەرك کردنەکان .

[ وما ثبت منه بالبديهة ﴾ ئەوەی ثابت بووە لەو زانیاریە ثابت دەبێ بە عەقڵ بە سەرەتای روانین بەبێ ئەوەی پێویستی ببێ بە فکر کردنەوە ﴿ فهو ضروري ﴾ ئەوە ناچارییە ﴿ كالعلم بأن كل شيئ أعظم من جزئه﴾ وەك زانیاری هەموو شتێکی تەواو کە گەورەترە لە پارچەیەکی [ وما ثبت بالاستدلال فهو اكتسابي ﴾ ئەو زانیاریەی سابت ببێ بە هۆی روانین لەبەڵگەدا ئەوە عیلمێکی دەستگیری ( إکتسابی) یە پەیدا دەبێت بە دەست گیر بوون .

﴿ والإلهام ليس من أسباب المعرفة بصحة الشيئ عند أهل الحق ] ئیلهام شت کەوتنە ناو دڵەوە هۆیەك نیە لە هۆکاری زانیاری بە دروستی شت لەلای ئەهلی حەق و راستی [11] .

---

(11) : شرح النسفية ل : ٣٥.

ئیلهام له لای صوفییەکان ئەو زانیاریەیە دەخرێتە ناو دڵ لە ڕێگای ڕێژەنی بەرەکەتی خوداییەوە , یەکێکە لەهۆکانی زانین[١٢].

ئـەو شـتـەی دەکەوێتـە دلـەوە هۆیـەك نیـە لـە هۆکـاری زانیـاری بـۆ گشتی خەڵك وە ناشگونجیٚ بە پێوویستی بگێری لەسـەر خـەڵك , وە لـە چاکەشدا نەبێت نابێت خودا دەفەرموێت : ﴿ فألهَمها فجورها وتقواها﴾ سوره الشمس : ٨ ، واتـە: ئینجا سروشت ئاگاداری کرد بەبەدکاریی و پارێزگاری خۆی وەکەم جارێك پەیدا دەبێت بۆهەندێك بەتایبەتی وەئەو زانیاریە پەیدا دەبێت بۆ خۆی نەك بۆ غـەیر , لەوانـەی پـەیدا بووە بۆی ئیلهام حەزرەتی عومەر بوو[١٣] .

وەك پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم) دەفەرموێت : " لقدَ كان قبلكم من بني إسرائيل رجال يُكَلَّمون من غير أن يكونوا أنبياء فإن يكن في أمتـي أحـد فعمـر" رواه الـشيخان والترمـذي واتـە: بەراسـتی لـە پێـشی ئێـوەوە لـە بـەنی ئیـسرائیل دا چـەند پیاوێـك بـوون قـسەیان کـردووە لـەبارەی شـتـەوە پـێش ڕوودانـی لـەڕووی ئیلهامـەوە لەلایـەن خـوداوە

---

(١٢) : عقيدي مرضية ل: ٨٤٧.

( ١٣) : شرح النسفية ل : ٣٥ .

لەپێغەمبەرانیش نەبوون ئەگەر یەکێك لە ئوممەتما ببێت عومەرە (رەزای خودای لە سەر بێت ).

جۆرەکانی ئیلهام :- لەوانەی پەیدا دەبێت بەکەوتنە ناو دڵەوە بەبێ دەست پێ کردن وەك بۆ دایکی حەزرەتی مووسا بوو بە فڕێدانی حەزرەتی مووسا لەناو تابووتدا , وەکەم جارێك لە خەوا دەبێت وەك بۆ حەزرەتی ئیبراهیم بوو لەسەر بڕینی کوڕەکەی , وەکەم جارێك بەهۆی فریشتەوە دەبێت . ئیمامی غەزالی دەفەرموویێت : ئەو زانیارییەی پەیدا دەبێت بەبەڵگە یا بەبینینی فریشتە لەسەر ڕاستیەتی ناو دەبرێت بە( وحی) ئەوەتایبەتە بە پێغەمبەران , وەیا بە بێ بینینی فریشتە ئەوە ناو دەبرێت بە " ئیلهام " ئەمە بۆ پێغەمبەران و ئەولیا دەبێت - ئەوە " العلم اللدنی " یە [١٤].

..........................................................................

وەك ڕوویدا بۆ حەزرەتی خضر لەگەڵ حەزرەتی مووسا وە حەزرەتی عەلی دەفەرموویێت : " لوضعت لي وسادة وجلست عليها

---

(١٤) : العلم اللدني : ئەو زانیاریە کە تایبەتە بە زاتی خوداوە وەنازانرێت بەهۆی مامۆستای ئەهلی زاهیر. تەفسیر الصاوي على الجلالين ٣/٢٠.

لحكمت لأهل التوراة بتوراتهم ولأهل الإنجيل بإنجيلهم وللأهل القرآن بقرانهم وهذه مرتبة لا تحصل بمجرد التعلم الإنساني" .

**واته: ئەگەر شتێكم بۆ رابخرێت و دانیشم لەسەری حوكم دەكەم بۆ ئەهلی تەورات بە تەوراتەكەیان وەبۆ ئەهلی ئینجیل بە ئینجیلەكەیان وە بۆ ئەهلی قورئان بەقورئانەكەیان وە ئەم پلەیە بە فێربوونی ئادەمیزاد پەیدا نابێت[١٥].**

(١٥) : شرح النسفية ل: ٣٦ .

## بەشی دووەم :

## ألإلاهيات : -

ئەم بابەتانەی لەخۆ گرتووە :

( ١ ) پەیدابوونی جیهان.

( ٢ ) بوونی زاتی خوا.

( ٣ ) سیفەتەکانی خودا و بێگەردی لە پەیدابووەکان.

( ٤ ) باسی - کلام -.

( ٥ ) بینینی خودا دروستە.

( ٦ ) کرداری بەندەکان لەنێو زۆر کردن و ئارەزوو.

( ٧ ) قەزاو قەدەر .

( ٨ ) داوا نەکردنی خودا لەبەندەکانی بە شتی مەحاڵ.

( ٩ ) خوداهۆکرەکانی دروست کردووە لەکاتی بوونی هۆکاندا نەک بەهۆیانەوە.

( ١٠ ) ئەجەل یەکێکە .

( ١١ )حەرام رزقی خودایە .

( ١٢ ) پێویست نیە لەسەر خودا کرداری چاکتر بکات بۆ بەندەی .

والعـالمَ بجميـعِ أجزائـهِ مُحْدَثٌ , إذْ هـوَ أعيـانٌ وأعـراضٌ فالأعيانُ ما لهُ قيامٌ بذاتِهِ وهو إمَّا مركبٌ وهو الجسمُ , أو غيرُ مركبٍ كالجوهرِ وهو جزءُ الذي لايَتَّجَزءُ والعرضُ: مـالا يقومُ بذاتـهِ ويَحْـدُثُ فـي الأجسامِ و الجـواهرِ _كـالألوان والطعـومِ والروائحِ . والمحدثُ للعالمِ هو الله تعالى .

---

[ والعـالم بجميـع أجـزاءه محـدث] **جگـه خـودا لهمـهو جـودا بـه هەموو پارچەکانیەوە لە ئاسمانەکان و ئەوەی تیایەتی و زەوی و ئەوەی لەسەر یەتی پەیدا کردووە یانی لەنەبوونەوە دەرکراوە بۆ بوون ,** ﴿ إذ هو أعيان و أعراض﴾ **"ئەعیان" و"ئەعراض"ە** ﴿فالأعيان مالـه قيام بذاته ] **ئەعیان شتێکە بەخۆیەوە رادەوەستێت** ﴿وهو إما مركب وهو جسم﴾ **ئـەعیان دووبەشـە یـا پێـك هێنـراوە ئـەوەش جیـسمە , جیـسم شـتێکە پێك هاتبێت لە دوو پارچە یا زیاتر لەسەر رایەك , یا لەسـێ پارچە پێك هاتبێت لەسـەر رایـەکی تـر**[16] **, لـە لای هەنـدێك پێویـستە پێك هاتبێت لەسێ پارچە بۆ ئـەوەی ببێتـە جـێ ی درێـژو پـانی و قـولی کـە پـێ ی دەوتـرێ** ﴿ أبعـاد الثلاثـة طـول ,عـرض , عمـق﴾[17]. ﴿أو غير مركب كـالجوهر﴾ **ئـەعیان یـان پێـك نـەهێنرابێ لـە پارچـە وەك جـوهر** ﴿كـالجوهر وهو جزء الذي لايَتَّجَزءُ﴾ **کـە پارچـەیەکە پارچـە پارچە ناکرێ یا جەوهەر شتێکە پارچە پارچە ناکرێ نە بەکرداری نە بە خەیالی نە بە دانان .** ﴿والعـرض: مـالا يقـوم بذاتـه﴾ **عـەرەض شـتێکە**

---

(١٦) : شرح النسفية ل: ٣٩

(١٧) : شرح العقائد ل : ٤١

خـۆی بەخۆیـەوە راناوەسـتێ ﴿ويحـدث فـي الأجـسام والجـواهر﴾ عــەرەض پەیــدادەبێت وە جێگـا دەگرێـت لـە ئەجـسام و جـەواهیرا ﴿كالألواني والطعوم والروائح﴾ عەرض وەك رەنگەكان و تامەكان و بۆكان .

﴿والمحـدث للعـالم هـو الله تعـالى﴾ دروسـت كـار بـۆ ئـەم جیهانـە پەروەردگارە زاتی "الله " زاتی "واجب الوجود" ە بەڵگە لەسەر بوونی خـودای گـەورە كـە ئـەم جیهانـە ئـەم زەویـەو ئاسمانـە ئـەم مـانگ ورۆژو ئەسـتێرانە كـە دەیـانبینی حـــادیثن ,واتــە:لــە پێـشدا نـەبوون تـازە پەیـدابوون ولـەپاش بـوون هـاتوون ,هەرشـتێك حـادیـث بێـت دروسـت كـەرەو پـەروەردگاری دەوێـت كـە لـە نەبوونـەوە دەری بكـات و بیخاتـە مەیدانی بوون .

..........................................................................

---

ئـەم بەڵگـەمان دوورسـتەیە : یەكـەم ئەوەیـە " كـە جیهـان حادیثــة "دووەمیان ئەوەیە" هەرچی حادیث بێت دروست كەری دەوێـت " روون كردنەوەی رستەی یەكەم ئەوەیە كە ئەگەر جیهان هـەمووی حادیـث و تـازە دروسـتكراو نـەبێت یـان هـەموو بەشـەكانی قەدیمـەو هـەربووە , یـا هـەنـدێكی قەدیمـەو هەنـدێكی حادیثـة , ئەگـەر بڵـێین هـەمووی قەدیمـە ئاشكرایە درۆیە لەگەل واقیع دا ناگونجێت و, ملیۆنەها بـەش دەبینین كە لـە پاش نـەبوون پەیـدا بوون , چ لـە ئادەمیزادو چ لـە گیانلەبـەران و گیاو دارو درەخت .

ئـەو بـارەیش کـە گوایـە هەنـدێکیان قـەدیم و هەنـدێکیان حادیـث ئەویش هەر درۆیـە,چونگە بەشـەکانی ئـەم جیهانـە هـەموو ماددەیـەو لـە پارچە پارچە تێکەل بووەو , ئەم پارچە پارچانە هەموو وەك یـەکن , جا ناچێتە عەقڵەوە کە کۆمەڵە شتێك تێکەڵ بن لە چەند پارچەیەکی وەکو یەك , هەندێکیان حادیـث بێـت و هەندێکیان قـەدیم , کەواتـە هـەمووی حادیثة .

ھەروەها روون کردنەوەی رستەی دووەم ئەم حادیثة . کەبە ئاشکرا هەیە , یاخۆی کاری لە خۆیا کردووەو هێناویەتیە مەیدانی بوون , یا شـتێکی تـر, غـەیری خـۆی . بەنـدی یەکـەم, کـە خـۆی کـاری لـەخۆیا کردبێت, شتێکی نەگونجاوو نارەوایە ,چونکە شتێ کە خۆی نـەبوو بـێ چۆن کـار لـەخۆی دا دەکـات و دەیهێنێـت ؟کـەوابوو دەبێـت بوونەکـەی لـەغیری خۆیـەوە بێـت و , ئـەو غـەیرەش نابێـت وەك ئـەم حادیـث بێـت , چونکە جیاوازیەك لەنێوان دا نیەو , هەردووکیان دروسـتکراوی دەسـتی زاتێکی بێسەرەتای لە هەموو لایەنێکەوە تەواو بێ خەوشە , کە شایەنی ئەوەیە کار لەشتی تر بکات و لەنەبوونەوە بیهێنێتە بوون .

بەڵگـەی ئـەهلی زانسـت لەسـەر بـوونی خـودای گـەورە ئەوەیـە ئـەم جیهانـە , چ عـەین و ( قـائم بالـذات ) بێـت , وەکـو ئـەو ماددانـەی دەیـان بیـنین لـەکان و گیـاو دارو گیانلەبـەر و ئـادەمیزاد , یـا عـەرەض و ( قـائم بـالغیر) بێـت , وەکـو رەنـگ و بـۆو زانسـت , هـەموویان حـادیثن , واتـە : لەپاش نەبوون پەیدابوون , مومکینن واتە : بوون و نـەبونیان وەك یەکـە

دیاره شتێك حادیث بێت پێویستی بەموحەدیثی هەیە ئەوموحەدیثـەش پێویستە

.........................................................

قەدیم بێت نەك حادیث , چونکە ئەگەر ئەویش حادیث بێت پێویستی بە موحەدیسێکی تر دەبێت و.

هەروەها بەڕێز دەڕوات جا یا ڕیز دەبەستێ و نابڕێتەوە و ئەمەش دەبێتە تەسەلسول , واتە : زنجیرە گرتنی بێ برانەوە کە عەقڵ هەرگیز قەبولی ناکات , چونکە زنجیرەی مەوجودات دەبێت دیاری بێت , شتی نەبراوەش دیاری نیە , کەوابێ زنجیرەی نەبراوەییەو , ئەو شتە کە ئەم حادیثە ی دروست کردووە پێویستە زاتێکی قەدیم بێ و هیچ شتێکی لێ پێش نەکەوتبێ ئەوەش زاتی خودای گەورەیە لەبەر ئەوەش کە ئەوشتە حادیثة مومکینە و لەخۆیدا بوون و نەبوونی وەکو یەك وایە پێویستە زاتێکی خاوەن تەئثیر خواستی بوونەکەی کردبێت و تەرجیحی دابێت بەسەر نەبوونیاو لە کاتی نەبوونیا ئەو زاتە خاوەن تەئپیرە قەدیمە خواستی نەبوونەکەی کردبێت و تەرجیحی دابێت بە سەر بونیا ، چونکە ئەو شتە مومکینە بوون و نەبوونی وەك یەکن و وەك دوو تای تەرازووی هاوکێش وەهان و , بێ گومان شتێك .

..............................................

نەخرێتە یەکێ لە دوو تای تەرازوو یەکێکیان دانەنەوێت و ئەوی تریان بەرز نابێتەوە , کەواتە لەمومکیناتدا دەبێت خالیقە موئەثرەکەی , کە تەرجیحی بوونی بەسەر نەبوونی دا دەدات , مەوجود بێت.

چونکە لە نەبوو هیچ پەیدا نابێت , هەروەها پێویستە ئەو خالیقە لە ریزی مومکیناتدا نەبێت , ئەویش وەك دروست کراوەکان نابێت بوون و نەبوونی وەك یەك بن ,ئەگینا ئەویش وەك حادیثە مەخلوقە کە دەبێت , بێگومان مەوجودێك کە لە مومکینات بەدەربێت تەنها "واجب الوجود" ە کە ذاتی خودای گەورەیە [18].

دەگێرنەوە کە بێ باوەڕێك لە پیاوێکی دەشتەکی پرسی : بەڵگەت چیەیە لەسەر بوونی خودای پەروەردگار؟! ئەویش لە وەلام دا ووتی : پشقل دەلالەت دەکا لەسەر حەیوانی کە ئەوپشقلەی کردوە, شوێن پێ دەلیلە لەسەر رێرەوێ کە بەو شوێنەدا رۆیشتوە , سەرم سور دەمێنێ ئەی چۆن ئەم ئاسمانە و ئەم خۆرو مانگ و ئەستێرانە,ئەم دەریا یان و بەرین وخاوەن شەپۆلانە دەلالەت لەسەر پەروەردگارێ ناکەن کە زاناو تەوانا و تەواو بێت و ئەم جیهانەی بەم رێك و پێکیە دروست کردبێت[19] ؟!

---

(١٨) : مەکتوباتی کاك ئەحمەدی شێخ ب : ١ ل:٥٤, ٥٥, ٥٦, ٥٧ .

(١٩) : مەکتوباتی کاك ئەحمەدی شێخ ب:١ ل:٥٦ وة شرح النسفية ل:٤٥ .

وە خوای گەورە دەفەرموێ:ولئن سالتهم من خلق السموات و الارض ليقولنَّ الله [٢٠] ئەگەر تۆ پرسیار بكەی لە كافرەكان :كێ ئاسمانەكان و زەوی دروست كردوە؟ لە وەڵام دا دەڵێن : خودا .

پیاوێكی دەشتەكی هاتە خزمەت پێغەمبەر(صلى الله عليه و سلم ) ووتی: ئەی موحەمەد نێرراوت هات بۆ لامان ووتی پێمان كە تۆ ووتوتە خودا ناردویتی ووتی : فمن خلق السماء ؟ كێ ئەو ئاسمانەی دروست كردووە ؟ فەرموی: خودا ووتی: فمن خلق الارض؟ كێ زەوی دروست كردووە؟ فەرمووی خودا , ووتی: فمن نصب هذه الجبال وجعل فيها ما جعل ؟ كێ ئەو شاخانەی داكوتاوەوە گەراندویەتی تیایدا ئەوەی

**الـــواحِــــدُ**

---

گەڕاندویەتی ؟ فەرموی خودا [٢١].

﴿الواحد﴾ یانی پەروەردگاری ئەم جیهانە یەك ذاتەو هاوبەشی نیە و تاك و تەنهایە پێویستە دروست كاری ئەم جیهانە یەكتا بێت لە زات و سیفات و كرداردا .

یەكتایی لە زات : یانی دروست كاری جیهان پێك نەهێنراوە لە چەند پارچەو ئەندامێك لەبەر ئەوەی ئەوانە لە تایبەتیەكانی پەیدابوونە

(٢٠) : سورة لقمان آية :٢٥ .ئە

(٢١) :رواه مسلم .

یەکتایی لەسیفات : یانی دروست کاری جیهان دوو توانایا زیاتری نیە, وە دوو ویست یا زیاتری نیە . وە بۆ کەس نیە سیفەتێك وەك سیفەتی خودا یا توانایەك وەك توانای ئەو یا ویستێك وەك ویستی ئەو

یەکتایی لەکردارەکان یانی لەگەڵ خوادا خودایەکی تر نیە لە پەیدا کردنی جیهان , وە مندالو ژنی نیە بەپێچەوانە بۆ (ثانویة) کە دەڵێن: دوو خودا هەیە , یەکێکیان دروستکاری خەیرە ئەوە " یەزدان" ە , دووەم دروستکاری شەرە ئەوە" اهرمن" ە بەمانا شەیتان , وتراوە یەکەم رووناکییە دووەم تاریکیە وە بە پێچەوانە بۆ هەندێك لەگاور دەڵێن خودا سێهەمی سیانە ئەوانە : " ذات , علم , حیاة " وەهەندێکیان دەڵێن " أب" باوك خودایە " إبن" کور عیسایە , و " أم" دایك مەریەمە . وە بەپێچەوانە بۆ " طبعیین " ە کان دەڵێن :خودا : " زحل , المشتري , المریخ, الشمس, الزهرة, عطارد, القمر" ة [٢٢] .

دوو بەڵگە لەسەر یەکێتی زاتی خودای گەورە لەزانایانی " متکلمین " ەوە دەگێرنەوە یەکەم ئەگەر دوو خودا بن کەهەردووکیان خاوەنی سیفاتی تەواو بن , کاتێ کەنیازی دروست کردنی شتێکیان کرد , وەکو جولانەوەی زەید لەشوێنێك ، لەم حالەتەدا یا ئەو جولانەوەیە بەهەردووکیان دەکرێت ئەمەیش دەبێت شتێکی تەنها لە ژێر دەسەلاتی دوو تەوانای تەواو دابێت . ئەمەش مەحاڵە چونکە هێزی خودایی بەش بەش ناکرێت و کەم و زیادی نیەو بۆ ئیجادی هەر مومکینێ لەمومکینات پەیوەندی پێوەیە کافی یە .

---

(٢٢) : شرح العقیدة النسفیة ل : ٥١,٥٢ .

وە ئەگەر بەیەکێ لەو دووانە دەبێ لازم دێ ( ترجیحي بلا مُرجح ) چونکە ئەوەی دەبێتە هۆی قادریەت زاتی خودایە ، هۆی مەقدوری یەتیش ئیمکانی مومکینە و نیسبەتی مومکینات بۆ لای ئەو دووخودایە یەکسانە و بێ جیاوازەو , کەوابێ ئیش کردنی یەکێکیان بەتایبەت هەڵەیە [٢٣].

دووەم : ئەگەر پەروەردگار دووان بن یا هەردووکیان حادیثن و لە نەبوونەوە پەیدا بوون ئەوە هیچیان بۆ خودایی ناشێن . ئەگەر یەکێکیان حادیثە و ئەویتریان قەدیمە, ئەوە حادیثەکەیان بەکاری پەروەردگاری نایەت , خۆ ئەگەر هەردووکیان قەدیمن ئەوا قودەماکان زۆر دەبن کە ئەمەش ناشێت...[٢٤].

خودا دەفەرموێت " [ لوكان فيهما ألهة إلا الله لفسد تا ﴾ [٢٥] واتە : ئەگەر بێجگە لە خودای عالەم چەن خودا یێ لەئاسمان و زەوویدا ببوایە پێویست بوو زەوی و ئاسمان تێك بچوو نایێ .

ئەوەی ریوایەتی کردووە موسلیم لە جابیر لە حەجی پێغەمبەر دا فەرموی ( فأهلَّ بالتوحيد....لبيك اللهم لبيك , لبَّيك لا شريك لك لبَّيك ..)

---

(٢٣) : عەقدەی مرضية ل: ١١٥ .

(٢٤) :مەکتوباتی کاك ئەحمەدی شێخ.

(٢٥) : سورة الأنبياء أية ٢٢ .

﴿القديم﴾ ذاتی خودا قەدیمە و حادیث نیە یانی سەرەتا بۆ بوونی نیە , صیفەتی " قدیم" ئەوەیە کە نەبوون پێش بوونی نەکەوتووە وەهەر بوە و کاتێك نەبوە کە خودای گەورە نەبوو بێت .

بەڵگەی عەقلی لەسەر قەدیمی ذاتی خودا ئەوەیە مادام حادیث پێویستە دروستکەری هەبێت , ئەو دروستکەرەش یا حادیثە, یا قەدیمە, ئەگەر حادیث بێت ئەویش پێویستی بەدروستکەری تر هەیە, ئەگەر هەروا ئەم زنجیرەیە بڕوات ئەوە دەبێتە "تسلسل" و ئەمەش,مەحاڵە و نابێت , خۆ ئەگەر زنجیرە نەڕوات ئەوە دەگەرێتەوە بۆ سەر حادیثي یەکەم و دەبێتە "دور" واتە: بوونی پەروەردگاری حادیثي یەکەم لەسەر بوونی خۆی ڕادەوەستێت , چونکە بوونی لەسەر بوونی حادیثە پێشوەکە ڕاوەستاوەو , بوونی ئەویش لەسەر بوونی ئەم ڕاوەستاوە, لەئەنجامدا بوونی پەروەردگار لەسەر بوونی خۆی ڕادەوەستێت و بەکورتی دەبێت لەیەك ئاندا هەم بێت و هەم نەبێت , ئەمەش ئاشکرایە پووچە[٢٦].

وەخودا دەفەرموێت:" هو الأول والآخر والظاهر و الباطن"[٢٧]

واتە هەر ئەوە پێشکەوتوو لەسەر هەموو مەوجودێك وەئاخرەودوای هەموو مەوجودێك هەر دەمێنێتەوە وەظاهیر وئاشکرایە لەبەرچاوی

(٢٦) : مەکتوباتی کاك ئەحمەدی شیخ ١/٥٩ .

(٢٧) : سورة الحديد أية ٣.

**ئەوانــە دا کــە شــوێنەوار دەکــەن بەبەڵگــە لەســـەر بـوونی پــەروەردگاری تـەوانا. وەبـاطنیـە لەبـەر چـاوی ئەوانـەدا کـە هـەر تەماشـای کـونهی ذات دەکەن.**

**وەپێغەمبـەر**( درودی خودای لە سەر بێت ) **دەفـەرموێت**" اللهـم أنـت الآول فلـيس قبلك شيء وأنت الآخر فليس بعد شيء"[(٢٨)] **واتـە: ئـەی خودایـە هـەر تـۆ پێش کەوتویت , هیچ شتێك نیە پێشت کەوتبێت ، وەتۆ ئاخری و هـیچ لە دوای تۆوەنیە.**

﴿الحـــيُّ﴾ **خــودای گــەورە زینــدوە بەزیندوویيـــەك کـە پەیوەنـدی بەمەزاج و لەشەوە نیەو, هەرگیز نابڕێتەوە زیندوویی صیفەتی ئەزەلیـە وەستاوە بە ذاتی خوداوە , ئەگەر**

القادر , السميع , العليم , البصير

---

**زیندوویەتی نەبێت عیلم و ئیرادەو قودرەت نابن...**[(٢٩)]..

﴿القادر﴾ **بەتوانایە یانی خـودای گـەورە دەسـەلاتی بـە سـەرهەموو مومکیناتدا هەیە , زەوی و ئاسمان و هەرچی لەواندا هەیە لەژێر تواناو دەسەڵاتی ئەو دایە .**

**وەکاری قودرەت بەپێی ئیرادەو خواستە, واتـە: هـەتا خـودا مـەیلی لەسەر شتێ نەبێ قودرەتی رووی تێ ناکات .**

---

(٢٨) : رواه المسلم.

(٢٩) : مەکتوباتی کاك ئەحمەدی شیخ ٦٨/١

﴿السميع﴾ بیسەرە یانی خودای گەورە هەموو دەنگێك دەبیسێت , لەدوور یا نزیك بۆ خودا دوورو نزیك نیە.

﴿العليم﴾زانایە یانی خودای گەورە لە ئەزەلەوە هەتا ئەبەد هەرچی بووەو هەرچی هەیە و هەرچی دەبێت بەهەمووی دەزانێت . پێویستە باوەڕمان وابێت کەزانینی خودا هەموو شتێك دەگرێتەوە, هەروەکو زاتی خودا ئەبەدییەو دوایی نایەت , زانینەکەشی بەو جۆرە نەبراوەیە . هەرچی دێتە دایەرەو وجودەوە بەسورەتی ذیهني و عەینی دەبێت لای خودا زانراو بێت هەرچی نەیێتە دائیرەی ووجودەوە بەلاّم لەوانە بێت ببێت وەك ئەم مومکیناتەی کە نین , یا هەر قابیل نەبێت بێتە دائیرەی ووجودەوە وەکو شتە موستەحیلە نەشودەنیەکان , ئەوە پێویستە سورەتێکی عیلمی ئەمانە لەلای خودای گەورە ببێت و لەبازنەی زانینی ئەو دەرنەچێت.

﴿البصير﴾ بینەرە یانی : هەرشتێك لە جیهاندا هەبێت ,کەم و زۆر , بچوك و گەورە خودای گەورە دەیبینێت . هەرچی مەوجوداتە چ ئەعیان و چ ئەعراض ئەوانەی خۆیان بەخۆیانەوە وەستاون یا ئەوانەی بە غەیرەوە راوەستاون وەك دەنگ و رەنگ هەروەها غەیری ئەو شتانەش کە دەبیسرێن و دەبینرێن , وەك تام و بۆ , هەموو زانراوی ذاتی یەزدانن: دەیان بیستێت و دەیان بینێت ...[٣٠] .

---

(٣٠) : مکتوباتی کاك ئەحمەدی شیخ ٦١/١

الشائي والمريد ليس بعرض, ولاجسم, ولا جوهر, ولا مصور, ولا محدود, ولامعدود, ولامتبعض, ولامتجريءٍ , ولامتركب, ولامتناه, ولايوصف بالماهية, ولابالكيفية,

---

﴿الشائي و المريد﴾ خاوەنی خواستە یانی هەرشتێك خواستی خودای لەسەر بێت دەبێت و , هەرچی خواستی ئەوی لەسەر نەبێت نابێت .

کاری ئیرادە بەپێی عیلمە , واتە : هەتا شتەکە لەعیلمی خودا دا نەبێت ئیرادەی رووی تێ ناکات.

عیلمی خوداش تابیعی مەعلوومە ، واتە : خودا دەزانێت ئەو شتە لەعالەمدا دێتە جێ ئەوسا ئیرادە رووی تێدەکات.[٣١]

﴿الشائي والمريد﴾ هەردووکیان دوو ووشەی "مترادف" ن , وەهێنانیشیان لێرەدا بۆتە بە روکییە بەفەرموودەی خودا "إن الله يفعل مايريد "[٣٢]واتە: بەراستی خودا خواستی لەسەر هەرچی بێ دەیکات.

﴿ ليس بعرض, ولاجسم, ولاجوهر﴾ خودای گەورە عەرەض نیە کە پێویستی بە مەوصوفێك هەبێ, وەکو رەنگی سپی یەتی کەعاریضی کاغەزێك دەبێت!

وەجیسم وجەوهەرنیە﴿ولامصور, ولامحدود, ولامعدود﴾ خودای گەورە خاوەنی وێنە و شەکڵ نیە , وەك وێنە ی ئادەمیزادو

---

(٣١) : مکتوباتی کاك ئەحمەدی شیخ ١/٥٣,٦٨ .

(٣٢) : سورة الحج : ١٤ .

دروســتکراوەکانی تــر, وەخــاوەنی ســنورو کۆتــایی نیــە, وەخــاونی ژمارەوزۆری نیە یانی خاوەنی جێگای"الکميات المتـصلة" نیە وەك ئەندازەکان وەخاوەنی جێگا "الکميات المنفصلة"یش نیە وەك ئەو شتە جیا جیایانەی ژمێردراون ﴿ولامتَبعض﴾ وەجێگای پارچەو بەش نیە ﴿ولامترکبٍ﴾ وەپێك نەهێنراوە لەچەند پارچەیەك .

﴿ولامتناهٍ﴾ وە کۆتایی نیە ﴿ولا یوصف بالماهية﴾ وەسف ناکرێت بە ماهیەت واتە ناوترێت : ئەوەچیيە, ئەوە چ رەگەزێکە, وەزاتی لەچ شتێك پێك هاتووە ؟﴿ولا بالکيفية﴾ وەچۆنیەتی نیە .

ولامتمكن في مكان

واتە ناوترێت وایە وەتامەکەی وایە وەگەرماییەکەی وایە وەساردیەکەی وایە.﴿ولامتمكن في مكان﴾ وە ثابت نیە لەجێگایەکدا خودا پێویستی بەجێگەو شوێن نیە وەك بڵێین : خودا لەزەویدایە یا لە ئاسمان دایە یا لەسەر عەرشە ، چونکە پەروەردگای عالەم لەپێش هەموو شتێك هەبوەو ئافەریندەی هەمووی دروستکراوەکانە و, کاتێك کە ئەو بووە مەکان جێگانەبووە. (٣٣)

ڕوونکردنەوەیەك : ڕای زاناکان سەبارەت بەو ئایەت و حەدیثانەی کەدەلالەت دەکەن لەسەرجیسمی خودا : چەند ئایەت و حەدیثێك هاتوون کە دەلالەت دەکەن لەسەر ئەوەی کەخودا جیسمی هەیە وەك دەست و چاوی روو قاچ و دابەزینی بۆ ئاسمان ....

(٣٣) : مکتوباتی کاك ئەحمەدی شیخ ٥٣,٦٨,٧٣/١

زاناکان لەو فەرمودانەدا بوون بەدوو مەزهەب و ڕێبازەوە

**ڕێبازی یەکەم** : ڕێبازی سپادرن و هەواڵە کردنە بۆ عیلمی خودا.﴿ تفویض﴾ ئەوەش ڕێبازی "سلف"ە , کە هەندێکیان ئیمامی ئەبو حەنیفەو , ئیمامی مالیك و ئیمامی ئەحمەدو ئیمامی شافیعی و موحەممەدی کوری حەسەن و سەعدی کوڕی موعاذی مەروزی و عەبدوللای کوری موبارەك و ئەبو موعاذ خالیدی کوری سولەیمان هاورێی سوفیانی ثەوری , و ئیسماعیلی کوڕی راهوە , و موحەممەدی کوڕی ئیسماعیلی بوخاری, و ترمیذی و ئەبو داودی سەجستانی یە .

فەرموویانە: بێگومان هەر فەرمودەیەك کە هاتووە لەقورئان و حەدیثدا لەو بارەوە ئێمە باوەڕ مان پێیەتی کە فەرمودەی خوداو پێغەمبەرە, وە ناڕۆینە خوارەوە لەلێکدانەوە و تەفسیر کردنیداو, تەئویلی ناکەین .وەفەرموویانە: خودا زاناتر بەوەی مەبەستیەتی , لەگەل ئەوەی باوەڕمان وایە نەڤ تەشبیە و لاشە دەکەن لەزاتی خودا [٣٤], زۆریان فەرموویانە : (إقروا کما جاءت) واتە : باوەڕتان ببێت پێی وەك چۆن لای خوداوە هاتووە بیخوێنەوە، وە مەڕۆن بۆ تەئویل و تەفسیرو لێکدانەوەیان .

.........................................................

بۆیە "ابن رشید " فەرمویەتی :"إن الصدر الأول إنما صار الی الفضیلة الکاملة والتقوی , بإستعمال هذه الأقاویل , دون تأویلات فیها

(٣٤) : شرح العقیدة النسفیة ل: ٦٨.

"[35] واته : بەراستی سەدەی یەکەم بۆیە بەدەستان هێنا تەواویەتی کەوریی خودا پەرستی بەهۆی بەکارهێنانی فەرمودەکان بەبێ"تأویل " کردن تیایاندا.

هەر لەبەرئەمەیە ئیمامی مالیك بەم شێوەیە وەلامی دایەوە کاتێك پرسیاری لێ کرا لەبارەی " إستواء" فەرمووی :( الأستواء معلوم والکیف مجهول .والسؤال عنها بدعة والأیمان به واجب ) واتە : ووشەی "إستواء" زانراوەو چۆنیەتی نادیارە . پرسارکردن لەبارەیەوە بیدعەیەو پێویستە باوەڕکردن پێی "

**ڕێبازی دووەم** : ڕێبازی "تأویل" ە , ئەویش ڕێبازی "خلف"ە

لەدوای ئەوەی ئیسلام بلاوبویەوە, وەگەلێکی زۆر هاتنە ناو ئیسلامەوە , کە ئارای فەلسەفی و بیرو باوەڕی فارسی تەئسیری لێ کردبوون . ناچار بوون زانایانی "خلف"کە"تأویل" ولێکدانەوەی ئەو ووشانە بکەنەوە کە باس لەجەستە و لاشە دەکەن بۆ زاتی خودا, بەلێکدانەوەیەك شیاو بێت بۆ زاتی خودا.[36]

شێخ عیزەدینی کوڕی عەبدو سەلام دەفەرموێت:" طریقة التأویل بشرطها , اقربهما الی الحق" واتە:ڕێگای " تاویل" ولێکدانەوە بە مەرجی خۆی,نزیکتریانە لە راستی و حەق ، لێرەدا چەند فەرمودەیەکی خوداوپێغەمبەر (دروودی خودای لە سەر بێت ) کە زانایانی "خلف"تەئویل و لێکیان داوەتەوە باسی دەکەین :

---

(٣٥) : اصول الدین الأسلامي ١/١١١.

(٣٦) : شرح العقیدة النسفیة ل: ٦٩.

١-خـودا دەفـەرموێت:"الـرحمن علـى العـرش اسـتوى"[٣٧]
ووشەی"الاستواء" بەمانا "الاستلاء والملك"تەئویلیان كردووە واتە:
ئەو خودا میهرەبانە كە دەسەڵاتی عەرشی داگیر كردووە لەژووری
هەموو ئاسمانەكان .

٢-خودا دەفەرموێت:﴿وجاء ربك﴾[٣٨] واتە : ( و جاء امرُ ربِّك )
فەرمانی پەروەردگاری تۆ هاتە خوارەوە .

## ولا یجری علیه زمان

٣ -پێغەمبەر (دروودی خودای لە سەر بێت) دەفەرموێت:(اذا قاتل احدكم اخاه
فلیجتنب الوجه,فان الله خلق آدم علی صورته).[٣٩] مەبەست بە
"صورة" خووە لە بیستن و بینین و ژیان وزانین. واتە كاتێك یەكێك لە
ئێوە شەری كرد لەگەل براكەیدابا خۆی بپارێزێت لە لێدانی دەم و
چاوی ,بەراستی خودا ئادەمی دروست كردووە لەسەر صیفەت و
خووی خۆی.

١- خودا دەفەرموێت :"ویبقى وجه ربّك"[٤٠]، ووشەی"وجه"
بەمانای"ذات" لێكیان داوەتەوە واتە: زاتی خودای تۆ دەمێنێتەوە
ولەناو ناچێت .

---

(٣٧) : سورة طه :٥.

(٣٨) : سورة الفجر :٢٢ .

(٣٩) : رواه الشیخان و احمد.

(٤٠) : سورة الرحمان:٢٧.

٥- خـــودا دەفــەرموێت :﴿یــد الله فــوق ایــدیهم﴾[٤١]. ووشــەی "ـد"بـەمانا( قـدرة) لێکیـان داوەتـەوە[٤٢] واتـە: هێـزو توانـای خـودا اەسەروی دەستی ئەواندایە .

﴿ولا یجری علیه زمان﴾ بەسەر خوادا زەمان و کات نایەت,خودای ؟ـەورە لـە زەمانـدا نیـیـە ,رابـووردوو و ئێـستا و ئاینـدەی بـۆ نـی ە،کەوابوو هەرگیز نابێت بڵێین:خودا لە زەمان دایە,

یالە مەکان دایە ,دەبێت بڵێین:خـودا لـەپێش ئەمانـەدا بـووە و لـە پاش دروسـتکردنی ئەمانـەش لەگـەڵ بـوونی مـەکان و زەمـان دا هەیـە ,وەکو لەپێش زەمان و مەکان دا هەبووە.

زانایـانی ئاییـنی بـۆ چەسپاندنی ئـەوەی خـودا لـە زەمـان دا نیـیـە ەڵێن:زەمان شتێکە هەمیشە تـازە دەبێتـەوەو, ئـەو شتانەی پـێ دیـاری ەکرێت کە گۆڕانیان بە سەردا دێت,کە مادام خـودای گـەورە گـۆڕانی ەسەردا نایەت ، پەیوەندی بەزەمانەوە نیيەو لە زەماندا نیـیە ....[٤٣]

## ولا یشبهه شیء ولا یخرج عن علمه و قدرته شیءٌ

زانـای پایـە بـەرزی خوانـاس سـەید عەبـدورحیم مەولـەوی لـە ﴿ ـضیلة﴾ دا دەفـەرموێت : - هـــــذا تـعـــالی الله عـــن زمـــان ـــن حـیز ,جـهة أو مـكـان

(٤١) : سورة الفتح :١١.

(٤٢) : اصول الدین الاسلامی ١/١١٤,١١٥,١١٦ .

(٤٣) مەکتوباتی کاک ئەحمەدی شێخ١/٦١,٦٢ .

عن ان يكون عرضا بحت بري وليس بالجسم ولا بالجوهر[٤٤]

خودا بەرزو بێگەردە لەوەی کات بروات بەسەریدا, وەبێگەردە لەشوێن داگیر کردن و روو و جێگا ، خودا بەرزو بێگەردە لەوەی عەرەض بێت وەخودا لاشەو جەوهەر نیە هەروەها دەفەرموێت .

متى "متى" حتى اتى عليه من أين "أين" ينتمى إليه[٤٥]

چ کاتێك ببێت ئەو کاتە بۆ زاتی خودا بوبێت وە تا بێت بەسەر زاتی خودادا , لەچ جێگایەکدا بوبێت تا ئەو جێگەیە نیسبەت بدرێت بۆ لای و پرسیار بکرێت لێیەوە ﴿ ولا يشبهه شيء ﴾ هیچ شتێك هاو وێنەی زاتی خودا نیە , وەك خودا دەفەرموێت ﴿ليس كمثله شيء﴾[٤٦] واتە: هیچ شتێك لەخودا ناچێت . وەماموّستا عبدالكريم دەفەرموێت[٤٧] .

بزانی خودا ووجودی حەقە قەدیم و باقی تەنهای موطلەقە

خۆی بەخۆی بووەو, هەروا ئەمێنێ ئەمما غەیری ئەو هیچ کەس نامێنێ

---

(٤٤) :الوسلة في شرح الفضيلة ص ٤٧٨ .

(٤٥) : الوسلة في شرح الفضيلة ص ٤٧٨ .

(٤٦) : سورة الشوريٓ : ١١.

(٤٧) : سەرچاوەی ئاپین : ٩و١٠.

بێ میثلو شـەریك , بێ ضید و پەیوەند     بێ دایك و بێ بـاب , بـێ ژن و
فەرزەند

حاکمـە بـۆ ئـــــەرز هـەم بـۆ سـەماوات       خالقـــە لـە بـۆ هـەموو
مەخـــلوقات

نەجەوهەر , نەجیسم نـەوەکو عـەرەض       نەئـەبێ بـەجێ ی حادیثـە و
مـــــــەرض

جیهە ت و جێگا بۆ زاتـــی نــــیە         زاتـــــی لـە ئـەمرۆ و سـوبحەی
بەری یە

﴿ولا يخرج عن علمه وقدرته شيء﴾ هیچ شتێك لەزانیاری و توانای خـودا دەرناچـێت ، واتـە: بەراسـتی خـودای گـەورە زانایـە بەهـەموو زانراوەکان بەجوزئی و کوللیەکانی , وە توانای هەیە .

بەسەرهەموو شتێك تاك بێت یان چەند ژمارەیەك بێت بەهێز بێت یان بێهێز بێت , بەپێچەوانەی فەلاسیفەکان وەك فارابی و ئیبن و روشد و ئیبن و سینا دەڵێن: خودای گەورە زانایە بەکوللی هەموو شتێك , وەزانا نیە بەجوزئیات بۆ نموونە : خودا زانایە بەبونی زەید وەنازانێت بەدەرچوون و هاتنە ژوور و جوڵەو وەستان.[1]

خودای دەفەرموێت :﴿والله بكل شيء عليم﴾سوره الحجرات :١٦ خودا بە هەموو شتێك زانایە.

وەهەروەها دەفەرموێت:﴿ وهو على كل شيء قدير﴾ : سوره الملك : ١ واتە : خودا بەسەرهەموو شتێكدا بەتوانایە.

﴿**وله صفات أزلية قائمة بذاته تعالي**﴾بۆ ذاتی خودا هەیە چەند صیفاتێکی ئەزەلی وەستاوە بە زاتی خۆیەوە و پێویستی بە غەیری خۆی نیە.

﴿ **وهي لا هو ولا غيره**﴾ ئەو صیفاتانە نەعەینی زاتی خودایە و نەغەیری زاتی خودایشە بەڵکو ئەو صیفاتانە زیادن لەسەر زات. واتە: بەراستی هەموو لەزات و صیفاتی خودا تەصەور ناکرێت جیا بۆنەوەی یەکێکیان لەوی تریان لەرووی بونەوە, با تێگەیشتنی زاتی خودا جگە تێگەیشتنی صیفات بێت . ئەوەی کەوتمان سەرناکێشێت بۆ تەعەدودو زۆریەتی , لەبەر ئەوەی غەیرییەت نیە لەنێوان زات و صیفاتدا . واتە :

---

(٤٨) : شرح العقيدة النسفية :٧٧.

زاتــی خــودا غــەیری صــیفاتی خودانیــە , وەجیــا نابنــەوە لەیــەك وەناگوازرێنەوە. [١]

زاناكان لە لێكدانەوەو تەفسیری صیفاتی مەعانیدا بەم شێوەی لای خوارەوە دواون:

**یەكـــەم** : جومهوری ئەشـاعیرە و ماتوریدییە دەڵـێن : بـێ گومـان خودا بیسەرە بەصیفەتێك كەناوببرێت بەبیستن , وە بینەرە بەصیفەتێك كەناوببرێت بەبینین....

..........................................................................

---

**دووەم** : مەزهــەبی موعتەزیلــە و فەلاســیفە وئیمامیــە نــەفی ئــەو صــیفاتە زیادانــە دەكــەن لــەزاتی خــودا. (خــودا) زانایــە بــەزات بــەبێ زانیاری, بەتوانایە بەزات بەبێ توانا. دەڵێن بەراستی ئەوەی قەدیم بێت زاتێكی تەنها قەدیمە , دروست نیە چەسپاندنی چەند زاتێكی قەدیم .

**سـێیەم** : دەڵـێن : بەراسـتی خـودا چەند صـیفاتێكی هەیـە بـەلام حادیثن, وقەدیم نین لەگەل زاتی خودادا.

ئێمە دەڵێین : بەراسـتی ئـەو صـیفاتانە عـەینی زاتـی خـودا نیـیە و غـەیری زاتیشـی نیـیە , بۆیـە عـەینی زاتـی خـودا نیـیە , ئەگـەر عـەینی زاتـی خـودا بێـت ئـەوە بـە پێویـست دەگـەرێت یـەك بـوونی زات و ئـەو وەصــفەش كــە وەســتاوەپێیەوە .وە بەپێویــست دەگــەرێت هاوەمانــا

---

(٤٩) : اصول الدين الاسلامي١/١٢٧

(ترادف) له نێوان ناو و وەصف دا ئەوەش مەحاڵە .وە لەبەر ئەوەی ئەم صیفاتانە غەیری زاتی خودا بن یا دەبێت خۆیان بەخۆیانەوە وەستا بن یا بەغەیرەوە، وەستانیان بە خۆیانەوە دەردەکەوێت بەتاڵە لەبەرئەوەی صیفەت بەشتێکەوە نەبێت ناوەستێت .

یا دەبێت وەستا بێت بەغەیری زاتی خوداوە , ئەوەی بەپێویست دەگەرێنێت وەصف دارکردنی غەیر بەزاتی خوداوە وە غەیری زاتی خوداش نەبێت ئەمە نامۆ نیە.

بۆ نمونە دەستی خالید نەزاتی خالیدە وەنەغەیری خالیدە لەبەر ئەوەی پارچەیەکیەتی [٢] ، ئیبنوتەیمییە دەفەرموێت : بەراستی چەسپاندنی زیندو و زانا و خاوەن حیکمەت و بیسەرو بینەر بەبێ ژیان و زانین و توانا و حیکمەت و بیستن و بینین موکابەرەیە [٣]بۆ عەقڵ ، وەك چەسپاندنی نوێژکەر بەبێ نوێژ رۆژوگر بەبێ رۆژوو وەستاو بێ وەستان[٤].

(٥٠) : شرح العقيدة النسفية:٨٣.

(٥١) : پێناسەی مکابرە: "منازعة في الكلام لإسكات الخصم لا لإظهار الصواب" گلنبوی أداب ص :١٢٢ اسماعيل الگلبوی . حاشية قەرەداغی واتە : بەگژاییەك چون لە قسەدا بۆ بۆردانی بەرامبەر نەك دەرخستنی راستی .

(٥٢) : أصول الدين الاسلامي . ١/١٢٩ .

## وهـي العلمُ, والقـدرةُ , والحيـاةُ , والقـوةُ, والـسمعُ , والبـصرُ, والآرادةُ , والمشيئةُ, و الفعلُ والتخليقُ ,

(وهي العلم) صيفاتى ئەزەلى بۆ زاتى خودا ، يەكەم : (زانست) ە , واتە : خوداى گەورە لەئەزەلەوە هەتا ئەبەد هەرچى هەيەو هەرچى دەبێت بەهەمووى دەزانێت .

(والقـدرةُ) توانا, واتـە: خـوداى گـەورە دەسـەلاتى بەسـەر هـەموو مومكيناتدا هەيە , ئەرزو ئاسمان و هەرچى لەوان دا هەيە لەژێر تواناو دەسەلاتى ئەو دايە.

(والحيـاة) زينـدوو,واتـە: خوداى گـەورە زينـدووە , بەزيندوويەتى يەك كە پەيوەندى بەمەزاج و لەشەوەنيە و هەرگيز نابڕێتەوە.

(والقـوة) بـەمانا تواناپـە , (والـسمع) بيستن,واتـە: خـوداى گـەورە هەموو دەنگێك دەبيسێت , لەدوور يا لەنزيك , بۆ خـوداى گـەورە دوورو نزيك نيە. (والبصر) بينين,واتە: هەرشتێك هەبێت , كـەم و زۆر , بـچوك و گـەورە , خـوداى گـەورە دەيبينێـت . (والارادة) خواسـت , واتە:هەرشتێك خواستى خوداى لەسەر بێت دەبێت , هەرچى خواستى ئـەوى لەسـەرنەبێت نابێـت . (والمـشيئة)بـەمانا خواسـتە,( الفعـل والتخليق)[53].

هەردوكيان و (الأيجاد والاِحداث والأختراعُ )چەند ناوێكى هاومانان بەمانا دەركردنى نەبوون.لەنەبوونەوە بۆ بوون .

---

(٥٣) : أصول الدين الاسلامي . ١/١٢٩ .

( والترزيــــق ) رزق و رۆزی  دان بــۆ كەســـێك لــەژیان دابێــت [٦].)

والكلام ) وتوووێژكردن . واتــە: خـودای گـەورە قسە لەگـەل پێغەمبـەرانی خۆیدا دەكات,

هەندێك لەزانایانی كەلام صیفاتی خودایان دابەش كردووە بۆ سێ بەش :-

یەكەم : صیفەتی نەفسی كە " وجود" ە واتە: بوون.

دووەم : "صیفاتي سلبیة " كەپێنج صیفەتە:-

١- صــیفەتی "قــدم" ە , واتــای "قـدم" ئەوەیەكـە نـەبوون پـێش بوونی نەكەوتووە و هەربووە و كاتێك نەبووە كەخودای گەورە نەبووبێ.

٢- صیفەتی بقـاء,واتـە: كاتێـك نابێت كـەخودای گـەورە نـەبێت و هەمیشە دەبێت .

٣- صـیفەتی " مخالفـة الحـوادث" , واتــە : زاتــی خــودای گــەورە لەهیچ زاتێك ناچێت سیفەتی لەسیفەتی كەس ناچێت.

٤- صیفەتی "قیام بالذات" ە , واتە: خودای گەور ە خۆی بەخۆی هەیە و پێویستی بەهیچ كەسێك و هیچ شتێك نیە .

٥- صیفەتی "    الوحدانیة" ە, تەنهایی یە, واتـە: خـودای گـەورە یەك زاتەو زاتێكی تر نیە لەگەلیاو صیفەتەكانی هەر بۆ ئەون و , كەس لەو صیفەتانەدا هاوبەشی نیە .

سێیەم : صیفاتی مەعانی كە حەوت صیفەتە:-

---

(٥٤) : شرح العقيدة النسفية : ٨٤ .

**١ -حەيات ٢- عيلم ٣-ئيرادە ٤- قودرەت ٥- سەمع ٦- بەصر ٧- كەلام**

**٦- وەزاناكان جياوازييان هەيە لەصيفەتى (تكوين) دا .[٧]**

**مامۆستا مەلا عەبدولكريم لەبارەى صيفاتى مەعانيەوە دەفەرموێت:**

صيفاتي حەوتن قەديمن وەك ذات    خاريجن لەدەرك عەقلي مەخلوقات

لە ذاتى ئاكي حەق جيانابن    بوون و هەن و ئەبێ هەر ببن

حەيات و عيلم و ئيرادەو قودرەت    سەمع و بەصەرو كەلام بەصيحەت

زيندووي و زانين و مەيل و توانين    بيستن و بينين طفتوطۆي شيرين [٨] .

**وهو متكلّم بكلامٍ هو صفة له أزلية ليس من جنس الحروف والاصوات ,وهو صِفة منا فية للسكوت والآفة, والله تعالىمتكلم بها أمر ناه مخبر**

---

( **وهو متكلم** ) خوداى گەورە قسەدەكات ( **بكلام** ) بەقسەيەك ( **هو صفة و له أزلية**) قسەكردن صيفەتى ئەزليە بۆ خودا ( **ليس من جنس الحروف والاصوات** ) لەرەگەزى پيت و دەنگەكان نييە ( **وهو صيفة منا**

---

(٥٥) :أصول الدين الأسلامي ج١ ، ص ١٠١ .

(٥٦) : سەرچاوەى ئايين : ١٠ و ١١ .

فیــة للــسكوت والافــة ) قـسەكردنی خـودا صـیفەتێكە پێـچەوانەیە بـۆ بێدەنگی و ئافات و خەوش و نەخۆشی نەفسی

( **والله تعالی متكلم بها أمرناه مخبر**) خودای گەورە بەو گوفتارییەی فەرمان دەداو قەدەغەدەكاو هەوالیش دەدا .

كـەلام صـیفەتێكی ئەزەلییـە دەربـەڕیوە بـەزمانی عـەرەبی كـەناو دەبرێت بـەقورئان وەبـەزمانی سـورەییانی بـە زەبور وەبـەزمانی یۆنـانی بەئینجل , وەبەزمانی عیبرانی بە تەورات .

زانایـانی موتەكـەلیم لـە كـەلامی خـودادا جیاوازییـان هەیـە بـەم شێوەیەی لای خوارەوە:

**یەكــەم** : ئـەهلی سـوننەت كەهەنـدێكیان ئەشـاعیرەو ماتوریدیـەن دەلێن : كەلامی خودا دوو جۆرە :

**جــۆری یەكــەم** : كـەلامی نەفـسی : (كـەلامی حەقیقەتـە) لێـك دەدرێتـەوە بەچـەند ووشـەیە كەلـە رەگـەزی دەنـگ و پیتـەكان نـی یـە , بەڵكو صیفەتی ئەزەلییە وەستاوە بەزاتی خوداوەو قەدیمە, مونافیە بۆ بیّ دەنگـی و ئافـات و خـەوش و نەخۆشـی نەفسی وەك لـەلال و منداڵدا دەسـت دەكـەوێت , بـەو كەلامـە ئـەمر و نـەهی و هـەوڵ دەدات و جگـە لەمانەش.

ئەم كەلامە قەدیمە لەبەر ئەوە قەدەغەیـە وەسـتانی حادیـث بـەزاتی خوداوە كەلامی نەفسی وەسـتاوە بـەزاتی خـوداوە , وەعیبـادەت و عیلم وئیرادە نیە . كەلامی خودا كۆتایی نیە وەك زانیاری[٩] .

---

(٥٧) : اصول الدین الاسلامي١/١٤٣ .

.............................................................

کەلامی نەفسی چەسپاوە لەزماندا, لەبەرئەوە بلاوە وتنی ناوی کەلام وە وتن بەسەر ماناکەیەوە وەستا بێت بە نەفسەوە وەك ئەخطەل دەڵێت :

إن الكلام لفي الفؤاد وانما جعل اللسان على الفؤاد دليلا

واتە : بەراستی وتەکان کەلام لەناو ئەو دڵەدایە -زمان کراوە بەبەڵگە لەسەر ئەو مانایەی لەدلدایە .

وەحەزرەتی عومەر دەفەرموێت :( إني زوّرت في نفسي مقالة) رواه احمد واتە : بەراستی من لە نەفسمدا قسەیەکم رێك کردووە.[10]وەلەقورئاندا هاتووە﴿ ويقولون في أنفسهم ﴾ [11] واتە لەناو خۆیاندا دەڵێن .

**جۆری دووەم**: کەلامی لەفظی : ئەمەش پیت و دەنگەکانە بەمە دەڵێن حادیثە و نەوەستاوە بەزاتی خوداوە , ئەوە قورئان و باقی کتێبە نێرراوەکانە .

قورئان بەمانای کەلامی نەفسی مەخلوق نیە , وەقورئان بەمانای ئەو ووشانە دەیخوێنێنەوە ئەوە مەخلوقە. بەلام قەدەغەیە بووترێت قورئان مەخلوقە مەبەست بەو ووشەیە کە دەیخوێنینەوە وە جگە

---

(٥٨) : هەمان سەچاوەی پێشوو شرح رمضان أفندي على شرح العقائد:١٣٦ و نورالايمان :٢٧ .

(٥٩) : سورة المجادلة : ٨ .

لەجێگای فێرکردن نەبێت , لەبەر ئەوەی کەم جارێك گومان دەبرێت قورئان بەواتەی کەلامی خودا مەخلوقە.

هەر بەهۆی ئەمەوە بوو ئیمامی ئەحمەد و شەعبی و بوخاری وعیسای کوری دینار کەوتنە ئەو تاقی کردنەوەوە .

دووەم : موعتەزیلەو شیعەی ئیمامیە دەڵێن : کەلامی خودا پێك هاتووە لەپیت و دەنگەکان بەلام ئەوەندە هەیە نەوەستاوە بەزاتی خوداوە , بەڵکو خودا دروستی کردووە لە ( لوح المحفوظ) یا لە جبریل یا لە پێغەمبەردا (دروودی خوای لە سەر بێت) , ئەو کەلامە حادیثە ، وە ئەمە مەحالە لەسەر زاتی خودا . [12]

**والقران كلام الله تعالى غير مخلوق وهو مكتوب في مصاحفنا محفوظ في قلوبنا مقروء بألسنتنا مسموع بأذاننا غير حال فيها**

---

سێیەم : موبتەدیعەی حەنابیلە دەڵێن : کەلامی خودا بریتی یە لە پیت و دەنگەکان , وەوەستاون بەزاتی خوداوە, وەقەدیمە هەتا هەندێکیان لە نەزانیدا رۆشتونەتە خوارەوە دەڵێن پێست و بەرگی قورئان قەدەغەیە, ئەگەر چی لەرووی رێزگرتن لە قورئانیشەوە بێت , قسەیەکی بەتاڵە .

چوارەم : کەرامیەیە هاودەنگن لەگەل حەنابیلە کاندا لەوەی کەلامی خودا بریتی یە لە پیت و دەنگەکان , بەلام ئەوەندە هەیە ناوی دەبەن بەفەرمودەی خوداو وبە حادیثی لە قەلەمی دەدەن , وەدەڵێن : وەستاون

---

(٦٠) : اصول الدين الاسلامي ١٤٤/١.

بەزاتی خوداوە لەبەر ئەوەی لای ئەوان دروستە وەستانی حەوادیث , بەزاتی خوداوە کەوتەیەکی بەتالە ، لەبەر ئەوە هەرشتیٚ حادیثی پێوەبوەستیٚ ئەوە حادیثە , وەچەسپاوە خودا قەدیمە.[١٣] .

( **والقران كلام الله تعالى غير مخلوق** ) قورئان فەرموودەی خودای گەورەیە مەخلوق نیە .( **وهومكتوب في مصاحفنا** ) قورئان کەلامی خودایە نوسراوەتەوە لەناو پەڕاوەکانماندا , ( **محفوظ في قلوبنا مقروء بالسنتنا** ) پارێزراوە لەدلماندا , و خوێندراوەتەوە بەزمانمان, (**مسموع باذاننا** ) بەگوێمان بیسراوە ( غير حال فيها) نەفسی قورئانە کەنیە لەگوێچکەماندا , بەڵکو قورئان ماناو هاووێنەیەتی کەوەستاوە بەزاتی خوداوە.

وەك دەوترێت بۆ نمونە ئاگر جەوهەرێکی سوتێنەرە , بەزمان باس دەکرێت و بەقەلەم دەنوسرێت وە بەپێویست ناگەرێت بە باس کردن و نوسینی بونی حەقیقەتی ئاگر دەنگ و سوتانەکەی دەست بکەوێت . واتە: هەرکەس باسی ئاگری کرد یا نوسی گەرمایی ئاگرەکەی پیٚ بکات[١٤] .

ئێمە دەیچەسپێنین بۆ شتێك چوار بوون ( وجود) وجود لەعەیندا وجود لە ئەزهانداو وجود لەعیبارەتدا وجود لەنوسیندا , بۆ نموونە ئاگر .

---

(٦١) : اصول الدين الاسلامي ١٤٧/١

(٦٢) : شرح العقائد النسفية : ٨٩ وشرح الرمضان أفندي :١٤٥

وجـــودی عـــەینی ئـــاگر حەقیقـــەت و جەوهـــەرە ســـوتێنەرە خاریجیەکەیەتی .

.............................................................

وجودی زیهنی ئاگر وێنەکەیەتی لەزیهندا .

وجودی عیبارەتی ئاگر ووتنی ووشەی ئاگرە

وجودی نوسینی ئاگر نەفسی ووشەی ( ئ ا گ ر ) ە

وجودە عەینیەکە حەقیقەتەکەیەتی ئەوی تری بەڵگەیە لەسەری و نەفسی ئاگرەکە نیە , ئەگەر ئاگرەکە بوایە دەبوایە ئەو کەسەی بیوتایە (ئاگر) زمانی بسوتایە, وەکاغەزەکە بسوتایە لەکاتی نوسیندا .

کـــەوابوو ســـێ ووجودەکـــە بەڵگـــەن لەســـەر یەکەمەکـــە کـــە وجودەحەقیقەتەکەیـە , نوسـینی ئـاگر بەڵگەیـە لەسـەر عیبارەتەکـە , وەعیبارەتەکە بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی لـەزیهن دایـە , وەئـەوەی لـەزیهن دایـە بەڵگەیـە لەسـەرئەوەی لەحەقیقـەت دایـە کەعەینەکـەی ئـاگرە سوتێنەرەکەیە .

دووبارەکەلام چوار بوون ( وجود) ی هەیە .

١ – وجودی عەینی – کەلامە ئەزەلیەکەیە وەستاوە بەزاتی خوداوە .

٢ –وجودی زیهنی – ئەوەیە پارێزراوە لە زیهن و خەیالدا .

٣– وجـودی عیبـارەتی – ئەوەیـە کـە خوێنەرەکـە قسەی پێدەکات لەکاتی خوێندنەوەدا.

٤ – وجودی کیتابی – ئەوەیە دەنوسرێتەوە لەلاپەرەی پەراوەکەدا .

ئێمە دەلێین وجودی یەکەم -کەعەینی یە- ئەوەصیفەتی خودایە و قەدیمە و مەخلوق نیە. ئەهلی سوننەت و جەماعەت دەفەرموون : کەلام صیفەتی ئەزەلییە وەستاوە بەزاتی خوداوە حادیث نیەو نەوەستاوە بەغەیری خۆیەوە .

بەلام موعتەزیلە سەرپێچی ئەمە دەکەن ثابتي ناکەن صیفەتی کەلام بۆزاتی خودا, دەلێن خودا قسەدەکات بەو قسەیە کەدروستی کردووە لەغەیری خۆیدا .

ئەم جیاوازییە کەدروست بووە لەسەر ئەوەبوو ئایا قورئان قەدیمە یان مەخلوقە ؟ ئەم مەسئەلە ناو براوە بە" مسئلة خلق القرأن " بەهۆیەوە فیتنەیەکی گەورە بەرپابووە لەنێوان موسولمانانـدا لەسەردەمی مەئموون ,کۆمەلێکی زۆر لە زانابەرزەکان کوژران و

والتكوين صفة ازلية وهو تكوينه للعالم ولكل جزئ من أجزائه وقت وجوده وهو غير المكون عندنا

---

سزادران و بەند کران لەسەر ئەوەی قایل نەبوون قورئان مەخلوقە, لەوانە ئیمامی ئەحمەدو غەیری ئەو .

دەگێرنەوە کە حەوسەد زانای بەرز کوژران لەسەر ئەوەی دانیان پیادا نەنا کە قورئان مەخلوقە. ئیمامی شافیعی رزگاری بوو لەو تاقی کردنەوەو رۆیشت بۆ میصر . دەگێرنەوە زۆریان لە ئیمامی شافیعی کرد لەسەر ووتنی خەلقی قورئان یا کوشتن , ئەویش ئامارەی کرد بۆ چوار پەنجەی دەستی راستی , تەورات و ئینجیل و زەبورو قورئانی پێ

ژمارد و فەرمووی : ئەو چوارە مەخلوقن , ئاماژەو مەبەستی هەر چوار پەنجەکەی بوو نەك هەرچوار پەرتوکەکە ,

ئەوانیش وا تێگەیشتن مەبەستی چوار پەرتوکەکەیە , رزگاری بوو لەکوشتن [١٥]. مەولەوی خودای لیٚ رازی بێت لەم بارەیەوە دەفەرموێت:

ثــم الـــكـــلام وصـــف أزلـــي قـــائـــم بـــذات ربـــنـــا العلى

لەبەر و دواو تەجەززی و عەدەد — لەحەرف و لەصەوت پاك و موجەررەد

وەصفێکی نەفسی و پاکیزە وقودسی —موناق سکووت ئافەتی نەفسی[١٦]

( **والتكوين** ) دەرکردنی نەبوون لەنەبوونەوە بۆ بوون ( **صفة أزلية** ) سیفەتێکی ئەزەلییە بۆ زاتی خودا ( **وهو تكوينه للعالم** )ئەوەش دروست کردنیەتی بۆ جیهان ( **ولكل جزء من أجزاءه** ) وەبۆ هەموو پارچەیەك لەپارچەکانیدا ( **وقت وجوده** ) لەکاتی بوونیدا (**وهو غير المكون عندنا** ) (تەکوین غەیری جیهان و پارچەکانیەتی لای ئێمە کە ئەشعەرییە . دووئیمامی ئەهلی سوننەت و جەماعەت لەگەل سیفاتی مەعانی پێشودا , هەر یەکی سیفەتێکی هەشتەمیان زیاد کردووە : شیخ ( أبوالحسن )ئەشعەری خودای لیٚ رازی بێت فەرموویەتی بەقاء سیفەتی هەشتەمە , واتە: مانەوەی هەتا هەتایی بیٚ نەبوون .

---

(٦٣) : شرح العقيدة النسفية :٨٨, ٨٩, ٩٠.

(٦٤) : عەقیدەی مرضية :٢٣٣.

## ورؤية الله تعالىجائزة في العقل وواجبة في النقل بإيجاب رؤية المؤمنين ألله تعالى في الدار الآخرة فيرى لافي مكان ولاعلى جهة من مقابلة أوإتصال شعاع أوثبوت مسافة بين الرائي وبين الله تعالى

شێخ ( أبو منصور) ی ماتوریدیش دەفەرموێت : تەكوین صیفەتی هەشتەمە كەواتەی دروست كردن وداهێنانی حەوادیثە هەركام لەكاتی خۆیدا . ئەم دوو ئیمامە هەریەكەی لەوان ئەو صیفەتەی زیادی كردووە بەصیفەتی وجودی و ثابتی دادەنێت بۆزاتی " واجب الوجود" .

بەلام زۆرتری ئەهلی سوننەت و جەماعەت هیچ كام لەم دووسیفەتانەیان بەسیفەتی وجودی دانەناوەو ووتویانەسیفەتی بەقا لەصیفەتە سەلبیەكانە واتە: (عدم الفناء) و, تەكوین لەصیفەتی ئیضافیەكانە . وەمەولەویش دەفەرموێت :

ئەشعری فەرمووی : بەقاهەشتەمین شێخ ئەبو مونصور فەرمووی:تەكوین

تەكوین لەلای ئەم , بەقا لەلای ئەو وەصفی وجودین ئەمما تۆ مەشنەو

حەق واتە : بەقا لەسەلبی یاتە تكوین لەجوملەی ئیضافی یاتە[17] .

( ورؤیة الله تعالى ) بینینی زاتی خودا ( جائزة في العقل ) دروستە لەلای عەقلْ . واتە : عەقلْ كاتێك رێگەی بدەیت حوكم نادات

---

(٦٥) : عەقیدەی مرضیة : ٢٣٧ و ٢٣٨ .

بەقەدەغەکردنی بینینی زاتی خودا مادام بەڵگەیە نەبێت لەسەر قەدەغەکردن .

( وَ واجبة في النقل ) چەسپاوە و رووی داوە لەبەڵگەی سەمعی ( قرآن و سنة) ( **بإيجاب رؤية المؤمنين ألله تعالىفي دار الآخرة** ) بەپێویست گەرانی بینینی زاتی خودا بۆ موسولمانان لە رۆژی دواییدا ، ( **فيرى لا في مكان** ) دەبینرێت نەلە جێگەدا ( **ولا على جهة** ) وە نە لەهیچ روویەکەوە ، ( **من مقابلة** ) نەلەبەرامبەر ( **او إتصال شعاع** ) یا بەگەشتنی تیشك .

( **أو ثبوت مسافة بين الرأي وبين الله تعالى** ) یا چەسپاندنی ماوەی دووری یا نزیکی لەنێوان بینەرو نێوان زاتی خودادا .

.......................................................

---

ئەهلی سوننەت و جەماعەت بروایان وایە دروستە بینینی زاتی خودا بەچاو بەبەڵگەی عەقڵی و نەقلی .

## ١- بەڵگەی عەقڵی : -

بەراستی ئێمە جیسم و عەرەض دەبینین لەسەر بنچیەی وەصفیەتی بەبوونەوە , ئەگەر نەبووبێت ناگونجێت بیبینی , لەبەر ئەوەی ئیتیفاقی لەسەرە نەبوو نابینرێت , بوون هۆیە بۆ دروستی شت ، هەرشتیٚ دروستە بینینی وەگومان لەوەدانیە کە زاتی خودا مەوجودە کەوابوودروستە ببینریٚ ، ناگونجیٚ بۆ ئێمە قەدەغەی بکەین مەگەر کاتێك چەسپاو بێت بۆ ئێمە بوون هۆ بێت لەدروستی بینینیٚ کە

بگونجێـت و بـەس یـا قەدەغـەبێت لـەڕووی پێویـستی یـەوە وە ئەمـە دەچەسپێت , ئەوە هۆیە کەدەمێنێتەوە لەسەر گشتییەتی خۆی . ئەگەر ووتیان: تام و بۆ مەوجودن بۆچی نابینرێن؟ دەڵێین: نەبینین قەدەغەنیـە لەلایـەن عەقڵـەوە , بـەڵکو خـودا لـە ئـادەمیزاد دا توانـای بینینیـانی دروست نەکردووە.(١٨)

٢ –هەنـدێك لـەخاوەن دەرکیاتـەکان(کشف) فەرموویانـە: بەراسـتی خــودا خــۆی دەردەخــات بــۆ ئــەهلی بەهەشــت دەیبیــنین لەپــەردەی صیفاتەکانیدا ، چونکە توانایان نیە خودا ببینن بەبێ پەردە.

ئیمامی غەزالی دەفەرمویێت:بێ گومان بینینی زاتی خودا جۆرە دەرکەوتن و زانیارییەکە.(١٩)

٣–ئەگەر بینینی خودا دروست نەبوایە بۆ چی حەزرەتی مووسا لەکاتی خۆیدا لەسەر کێوی طور داوای لەخوداکرد و فەرمووی : ﴿ربي أرني أنظر إليك﴾ ئاخۆ خودای گەورە لەوەلامی مووسا فەمووی : ﴿ لن أريك﴾ واتە : هەرگیز خۆمت پیشان نادەم ؟یا فەرمووی ﴿لن أرى ﴾ واتـە: هـەگیز نـابینرێم ؟ نـەخێر خـودا هـیچ کـام لەمانـەی نەفەرموو, بەڵکو بە ﴿لن تراني﴾ سورەتی الاعراف ئایە ١٤٣ .

وەلامـی دایـەوە ,واتـە تـۆ بـەم بـارودۆخو شـێوەی مـاددی یـەوە من نابینی , راوەستە

..................................................................

(٦٦) : شرح العقيدة النسفية : ٩٧ .

(٦٧) : شرح العقائد :١٣٠

**بازیندوو بوونەوەی دوارۆژ بێتە بێشەوە و بەئەمری من خەلاتی مانەوە و نەمریت بۆ بنێرێت ئەو کاتە دەمبینی.[20]**

**٤- خودا دەفەرمویت** ﴿وجوه يومئذ ناضرة إلى ربها ناظرة﴾[21]

**واتە لەو ڕۆژە چەند ڕوویەك زۆر جوانن و بۆ زاتی خودای خۆیان دەروانن . لەم ئایەتە وە دەردەکەوێت کەموسولمانان لەرۆژی دووایدا رووخۆش و دلشاد دەبن و بەچاو پێکەوتنی خودا بەهرەمەند دەبن .**

**٥- خودا دەفەرمێت لەحەقی کافراندا :**﴿كلا إنهم عن ربهم يومئذ لمحجوبون﴾[22] **واتە: ئەوکەسانەی لەرۆژی قیامەت دا لەدیتنی خودا بێبەش و مەحجوبن و لەو بەشە گەورەدا بارەیان نیە .**

**٦- پێغەمبەر فەرمووی بەهاورێکانی :**" إنكم سترون ربكم كما ترون القمر ليلة البدر [23]" **واتە: ئێوە لەمەو دوا - لەپاشەرۆژدا خودای خۆتان بەچاو دەبینین وەك چۆن ئێوە مانگ لەشەوی چواردەدا دەبینن .**

**بە پێچەوانەی موعتەزیلە وە کە دەڵێن : بینینی زاتی خودا قەدەغەیە , دەڵێن خودا دەفەرمویت** ﴿ ربِّ أرني أنظر إليك قال لن تراني ولكن أنْظُر إلى **الجبل** فإن استقر مكانه فسوف تراني ﴾[24] **واتە**

---

(٦٨) : عقيدة مرضية :٢٦٧ .

(٦٩) : سورة القيامة : ٢٣ .

(٧٠) : سورة المتطفين : ١٥ .

(٧١) : رواه البخاري.

(٧٢) :سورة الأعراف:١٤٣

حەزرەتی مووسا وتی : ئەی خودایە خۆتم نیشان بدە با بۆت بروانم , وەخودا فەرمووی : تۆ بەهیچ شێوەیەك لەم نەشئەدا من نابینی بەلام من دەمەوێت بۆ ئەوە حاڵی ببی کە نەبینینەکەی تۆ بۆ من لەسەر بێ لوتفی من نیە بەڵکو لەسەر ئەوەیە کە وێنەی تۆ لەماددەی مەخلوقاتی ئەو جیهانە تاقەتی ئەوەیان نیە , بروانە بۆ ئەم کێوە من پرتەوی زاتی خۆمی بۆ دەنوێنم جا ئەگەر لەبەر پرتەوی ئەنواری زاتی من دا ئارامی گرت و مایەوە ئەوە تۆیش لەپاش ئەوە دەمبینی .

.....................................................

---

١- دەڵێن :ووشەی(لن) بۆ دووپات کردنەوەی نەفی لەمەو دوایە و هەتا هەتاییە .

٢- خودا دروستی بینینی خۆی بەستوە بە جوڵە نەکردنی کێوەکە.

## وەلام :

١ – ووشەی (لن ) بۆ نەفی هەتا هەتایی نیە , ئەگەر وا بوایەخودا نەی دەفەرموو لەبارەی جوولەکەکانەوە:﴿ ولن يتمنوه أبداً﴾[٢٥]واتە: هەرلەئیستەوە تا دێر زەمان داوای مردن ناکەن .

لەگەل ئەوەی قورئان باسی دەکات ئاوات دەخوازن بمرن لەرۆژی دواییدا کاتێك دەرۆنە ناو دۆزەخەوە :﴿ يا مالك ليقض علينا ربك

(٧٣) : سورة البقرة : ٩٥ .

﴾[٢٦] واته : ئەی مالیك داوا لەخودای خۆت بكە بافەرمانی لەناوبردنی هەمیشەیی بدا و لەم سزایە رزگاربین .

وەفەرمودەی : ﴿ یالیتها كانت القاضیة ﴾[٢٧] واتە : خۆزگە ئەو مردنە كەمردم هەرئەوە بوایەو ئیتر دوای ئەوە زیندوو نەكرایەمەوە.

٣- جوڵە نەكردنی كێوەكان مەبەست نیە لەزاهیری ئایەتەكەدا.

مەحوی شاعیرش دەفەرموێ و ئیسباتی بینین دەكات بۆ حەزرەتی محمد (صلی الله علیه و سلم ) :

كەلیم ( ارنی ) كە فەرموو هەر جوابی ( لن ترانی) ی دی

موشەرەف بۆ موحەممەد بێ طەلەب بەو مەرتەبە و شانە

عوروجی عیسەوی ئاسمان و شەمسی عالەم بو

عوروجی ئەحمەدی تا ( لامكان) و شەمسی جانانە [٢٨] .

## وألله تعالى لأفعال العباد من الكفر والأيمان والطاعة والعصيان وهي كلها بإرادته ومشيئته وحكمه وقضيته وتقديره

( **وألله تعالى خالق لأفعال العباد** ) خودای گەورە دروستكارە بۆ كرداری بەندەكانی لەفریشتەو ئادەمیزادو پەری و گیاندارانی تر , دروست كاری تریان نیە جگە لەزاتی خودا ئەمە مەزهەبی هاورێكانی

---

(٧٤) : سورة الزخرق :٧٧

(٧٥) :سورة الحاقة : ٢٧

(٧٦) : دیوانی مەحوی لاپەرە ٤٣٤ .

پێغەمبەرە (دروودی خوای لە سەر بێت) . (من الكفر والآيمان والطاعة والعصيان) لە كوفرو ئیمان وگوێرایەلی كردن "طاعـة" و بێگوێیی . ( وهي بإرادتـه ومشيئته , ) كرداری بەندەكان هەمووی بەخواستی خودایـه , ( وحُكمـه ) بەفەرمانی بوون لە لایەن زاتی خوداوەیە ( وقضيته ) بەقەزای خودایـه , ( وتقديره ) بەدیاری كردنـی , هـەموو دروسـتكراوێكی بـەدیاری كردنـی خۆی كەدەست دەكەوێت لەجوانی و ناشیرینی و قازانجو زیان وەئەوەی چوار دەوری داوە لەكات و جێگاوە ئەوەی دەچێتە سەر ی لەپاداشت و تۆڵە .

جەبرییـە دەڵـێن : مـرۆڤ زۆر لێكـراوە بـەكردەوەكانی لەهەسـتان و دانیشتن و رۆیشتن و عیبادەتو جگە لەمانەش ئارەزووی بۆ نیـە هـەموو ئـەمرێك دەگەرێتـەوە بـۆ خواسـتی خـودا لـە هـەموو كـرداری مرۆڤـدا . بەڵگەش دێننەوە بەفەرمودەی خودا : ﴿ هو الذي يصوركم في الارحـام كيف يشاء ﴾[٢٩] واتە : ئەو خودا خودایەكی وایە تەصویر تان دەكات و پەیكەردارتان دەكات لەناو مندالداندا لەناو سكی دایكدا هـەر چۆنێك خواسـتی هــەبێت , جـوان بێــت یــان ناشــیرین . وەهــەروەها خــودا دەفـەرموێت : ﴿ وربـك يخلـق مايـشاء ويختـار ماكـان لـه الخيـرة..﴾[٣٠] واتە : خودای تۆ دروستت دەكاو ئیجادت دەكات ئەوەی خواستی خۆی بێت و هەڵدەبژێرێت ئەوەی بیەوێت بیكات ,وەهەرگیز نەبووەو نابێت بۆكەسێ لە پەری و ئادەمیزاد و فریشتە ماف هەلبـژاردن بەسـەر خودادا بدەن .

---

(٧٧) : سورة ال العمران : ٦

(٧٨) :سورة القصص : ٦٣

وەڵام دەدرێتەوە لەسەری : بەراستی ئەم رایە سەر دەکێشێت بۆ وەستانی هەموو رووڵێنانێکی شەرعی لەبەر ئەوەی تیۆری (إجبار) زۆر لێکردن دژایەتی دەکات و کۆ نابێتەوە لەگەل ( تكليف ) رووڵێنان .

............................................................

---

وەموعتەزیلە دەڵێن :بەراستی مرۆڤ خۆی دروستکارو بەدی هێنەرە بۆ کردەوەکانی ، ناچار بوون لەبەر ئەو قسەیە خۆیان پاراستوە لەوەی خراپەکاری نیسبەت بدەن بۆ لای خودا . لەبەر ئەوەی بیروباوەڕیان دامەزراوە لەسەر ئەوەی کرداری چاك بۆ بەندە پێویستە لەسەر خودا .

وەبەڵگەیان هێناوەتەوە لەسەریان بەمانەی خوارەوە:-

١ - ئەگەرکرداری بەندە دروستکراو بێت بۆ زاتی خودا رووی لەهیچ بەندەیەکی نەدەنا

٢ - ئەگەر خودا دروستکاربێت بۆ کرداری بەندەکانی ئەوە خودا دەوەستێت و دادەنیشێت و دەخوات و زینا دەکات و دزی دەکات و جگە لەمانەش پەنا بە خودا .

٣- خودا دەفەرموێت بەحەزرەتی عیسا﴿ وإذ تخلق من الطين كهيئة الطير﴾ [٣١] واتە : باسی ئەو کاتە بکە کە هەیکەل و قەوارەت دروست دەکرد لەقور وەکو هەیکەلی پەلەوەر . نیسبەتی زاتی دروست کردن بۆ لای عیسا ئەوەبەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەو بەندە کرداری خۆی دروست دەکات .

---

(٧٩) : سورة المائدة : ١١٠

٤- خودا دەفەرموێت :﴿ فتبارك الله أحسن الخالقين﴾ [٣٢] ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی لێرەدا دروستکار هەیە جگە لەخودا گەر وانەبوایە نەی دەفەرموو( أحسن الخالقين) .

**باوەڕی ئەهلی و سوننەت و جەماعەت وایە : بەراستی ئەو کردارانەی دروست دەبێت لەجیهان دابەش دەکرێت بە دووبەشەوە .**

**بەشی یەکەم** : ئەو کردەوانەی بەهۆی بەندەوە پەیدا نابێت وەك باران و جولانەوەی فەلەك و سەوزبوونی گژو گیا وەزاڵ بوونی خەو و نەخۆشی و هەژاری و تەندروستی لێدانی دڵ و زیرەکی و تەمەڵی ...ئەمە تەنگو چەلەمەی تێدانیە بەدانان و دروست کردنی خودایەو ئارەزووی مرۆڤی تێدانیە لەروودانیدا , ئەوەمەبەست بەقەزاو قەدەرە خێر بێت یان شەر .

**بەشی دووەم** : ئەوەیە بوون لەدروستکردنی ئەو کارانەدا دەست گیر ببێت بۆ ئادەمیزاد وەهەوڵدان و ئارەزوو بێت وەك خواردن وخواردنەوەو هەستان و .... ئەم کردارانە دروستکراوی خودان لەرووی زاتی کردارەکاندا نەك لەرووی سیفاتەکانیدا . لەرووی زاتەوە ئەوە خودا دروستی کردووە لەئادەمیزاددا هەوڵ دان بۆ ئەو کردارانە , عەقڵی بەخشیوە و دروستی کردووە بۆ ئەوەی ڕێنمایی بکات وەدروستی کردووە تیایدا تواناو شیاوی بۆ دروستکردنی , ئەوەندە هەیە خودا دروستی دەکات دووای ئەوەی ئادەمیزادەکە نیازی ئەو

(٨٠) : سورة المؤمنون : ١٤

کاره دەکات و رووی لێدەکات . وەئەو کرداره لەرووی وەصفەوه ئەوەیە ئەو کرداره جوانە یان ناشیرنه ئەوه جێگەی گەرانەوەیه بۆ پەسەند کردنی ئەو ئادەمیزادەو خواست و کەسب و پەیدا کردنی .

قابیلیەت و گەران بۆئامادەکردنی ئەم دووانە خوازراوه لەو ئادەمیزادا کەدەگونجێن بۆ روودانی کردارێك . کەپاداشتی تیا بێت یا تۆلەی تیادا بێت . وەهەلبژاردنی یەکێك لەدووکرداره جێگای گەرانەوەیه بۆ خواستی ئەم ئینسانە لەبەر ئەمەیە خودا دەفەرموێت: ﴿لها ماکسبت﴾ له چاکه ﴿وعليها ما اكتسبت﴾[٣٣] لەخراپە.

ئا ئەم بەشە لەم کردارانەدا بۆی هەیە دووروانین پەیدا بوونی بەهۆی مومکین بونی لەلایەن زاتی خوداوەبوو ناودەبرێت بەدروستکراوی خودا . وەبوونی ئەو کرداره بەئارەزووی ئەو ئادەمیزادە بوو ئەوە ناو دەبرێت بەکەسب( أكتساب) بۆی[٣٤] .

ئەصلی ~~سێهەم~~ لەشەش ئەصلی ئیمان کە ئیمان و باوەڕ بەقەزاو قەدەره قەزا لای زانایانی ئەشعەری بریتیە لەئیرادەو خواستی ئەزەلی خودا کەپەیوەندە بەشتەکانەوه بەو حال و جۆره لەپاشەرۆژدا لە( مالایزال)دا لەسەری دەبن . قەدەریش بریتییە لەئیجادو دروستکردنی خودا بۆ ئەو شتانە هەریەك لەکات و وادەی خۆیدا لەسەر ئەو ئەندازه

---

(٨١) : سورةالبقرة : ٢٨٦

(٨٢) : شرح العقيدة النسفية: ١٠٥

که بریاری داوه و لەسەر ئەو حاڵ و صیفەتانە کەخواستی خۆی دیاری کردوون [٣٥].

**وللعبــاد أفعــال إختياريــة يثــابون بهــا ويعــاقبون عليهــا , والحسن منها برضاءِ الله تعالى . والقبيح منها ليس برضائه**

---

مەبەست لەباوەڕکردن بە قەزاو قەدەر ئەوەیە :-

١- بەراســت زانــین کــەبێگومان زاتــی خــودا زانایــە بەهــەموو دروسـتکراوەکانی لەئەزەلـدا, وەئـەوەیش پەیوەنـدی دەبەسـتێت لەمـەو دوا .

٢- بەراسـت زانـین کـەبێگومان هـەموو دروسـت کراوەکـانی خـودا لەنەبوونـەوە بۆ بوون بەخواستی خودایـەو رێکـی عیلمـی ئـەزەلی زاتـی خودایە .[٣٦]

مامۆستا مەلا عبدالكريم دەفەرموێت :ئیمان بەقەزاو قەدەر ئەوەیە بـاوەڕت بـبیٚ هەرچـی لـەم جیهانــە دا پەیـدا دەبێـت خـودا لەئەزەلـدا زانیویەتی وەخواستی کردووە لەکاتی پەیـدابوونی دا بـەقودرەتی خـودا پەیدا دەبێت وەلەگەڵ ئەمەدا لەکارو فەرمانی ئیختیاریـدا وەکودانیـشتن و رۆیـشتن و وێنـەی ئەمانـە بەنـدە ئیختیـارو کەسـبی هەیـە وەتـەئـثیری خودا شوێن کەوتـەی ئیختیاری بەندەیە واتـە: بەنـدە چۆن ئیختییـاری

---

(٨٣) : عقیدەی مرضية : ٦٧٥ .

(٨٤) : أصول الدين الإسلامي :١/١٦٣ .

ببێت خودا وای دروست دەکات وەخودا رازیە بەکەسبی خێر وەنارازیە بەشەر [٣٧]

( **وللعبــاد افعــال اختياريــة** ) بـۆ بەنـدەكان هەيـە كـردارە سەرپـشك كراوەكـان لەلایـەن خۆیـەوە بە بـێ زۆر لێ كـردن ( **يثـابون بهـا** ) پاداشـت دەدرێتــەوە بــەهۆی ئــەو كــردەوە ئەگــەر گــوێ رایــەڵی خــودا بــوون (ويعاقبون عليها)وەسزايان دەدرێت ئەگەر بێ گوێی خودا بوون .

( **والحسن منها** ) ئەو كـردارە چاكەیە لـە كـرداری بەنـدەكان دا كـە پەیوەندی دەبەستێت پێیەوە ستایش لە دنیادا و پاداشت لە دوا رۆژ دا ( **برضاء الله تعالى** ) بەرەزاو خواستی خودا دەبێت.

( **والقبيح منها** ) ئەو كردارە ناشیرینیە لـە كرداری بەندەكاندا كـە پەیوەنـدی دەبەسـتێت پێیـەوە زەم لـە دنیـا و سـزا لـە دوارۆژدا . ( **لـيس برضاءه** ) بە رەزاو خواستی خودا نییە .

## والإستطاعة مع الفعل وهي حقيقة القدرة التي يكون بها الفعل

لەبەر ئەوەیـە رەخنـەی لەسـەرە ، خـودا دەفـەرموێت :﴿ولا یرضـى لعباده الكفر﴾ [٣٨] واتە: خودا رازی نیيە بە كوفر بۆ بەندەكانی .

كـرداری ئیختیـاری بەنـدەكان نیـسبەت دەدرێـت بـۆ زاتـی خـودا لـە رووی دروست كردنەوە وە بۆ بەندەكە لە رووی كەسب و "اكتساب"ەوە.

زانیمـان كـە بەنـدەكان جێگـای پـر ولێ نـانی خـودان لەبـەر ئەوەیـە پاداشـتیان دەدرێتــەوەو تۆڵــەیان لێ دەســتێنرێتەوە .وەبەڵگــە لەســەر

(٨٥) : سەرچاوەی ئایین : ٧١ .

(٨٦) :سورة الزمر :٧ .

ئیختیاری بەندەکان لە کرداردا خودای تەعالا دەفەرموێت:﴿فمن شاء فليؤمن ومن شاء فليكفر﴾[39] واتە: هەر کەس خواستی ئیمان هێنانە با ئیمانی بێنێ و هەر کەسێ خواستی لەسەر کوفر و بێ ئیمانیە با کافر بێت .

وە بەڵگە لەسەر پاداشت و تۆڵە سەندنەوە لەسەر کرداری بەندەکان خودای گەورە دەفەرموێت:﴿جزاء بما كانوا يعملون﴾[40] واتە: پاداشتی خێری ئەو کردەوانەی کە دەیان کرد ... .

**( والإستطاعة مع الفعل )** هێزو توانا لەگەڵ کردار دایە **( وهي حقيقة القدرة التي يكون بها الفعل )** هێزو تواناوراستی حەقیقەتی توانایە کە بەهۆی ئەو تواناوەکرداری بەندەدەبێت . خاوەنی "تبصره" کە یەکێکە لە زانا گەورەکانی حەنەفی دەڵێت:(انها عرض يخلقه الله تعالىفي الحيوان يفعل به الأفعال الأختيارية وهي علة للفعل ) هێزو توانا پەیدابووە خودا لەحەیوانات دروستی دەکات , بەهۆی ئەو هێزەپەیدابووەوە کردارە ئیختیاریەکان دەکات وەهۆیشە بۆ کردارەکان , وەجمهور لەسەر ئەوەن دەڵێن :( أنها شرط لإداء الفعل لا علة ) هێزو توانا مەرجە بۆ جێ بەجێ کردنی ئەو کردارە نەك هۆ وەئەو هێزو توانایە ( إستطاعه ت) خودا دروستی دەکات لەبەندەدا لەکاتی نیازکردنی کەسبی ئەو کردارە لەپاش بێگەردی هۆکان و ئالەتەکان ئەگەر بەندە کە لە نیازی چاکەی کرد خوا هێزی کردنی چاکەی تیادا

---

(٨٧) : سورة الكهف :٢٩.

(٨٨) : سورة السجدة :١٧ .

دروست دەکات , وە ئەگەر نیازی خراپەی کرد خودا هێزی کردنی خراپەی تیادا دروست دەکات.

**ویقع هذا الاسم على سلامة الآسباب والالات والجوارح . وصحة التكليف تعتمد على هذه الآستطاعه ولايكلف العبد بما ليس له في وسعه , ومايوجد الآلم في المضروب عقب ضرب إنسان والآنكسار في الزجاج عقب كسر إنسان وما أشبهه وكل ذلك مخلوق لله تعالى لا صُنع للعبد في تخليقه. والمقتول ميت بأجله , والموت قائم بالميت مخلوق لله تعالىلا صنع للعبد في تخليقاً وَ لا إكتساباً**

---

( **ويقع هذا الاسم** ) ئەم ووشەی " إستطاعة " لەیرەدا بە سەر ئەو بەشەدا پێناسە دەکرێت ( **على سلامة الآسباب** ) کە دەچێتە سەر " إستطاعة" بیٚ گەرد بێت هۆکانی ئەو کردارە ( **والالات**) وەئالەتەکانی و ئەم ئالەتە هۆیە لەنێوان ئیش و کارو ئیش تیا کراو ( **والجروح**) وەسەلامەتی ئەندامەکانی[٤١] ( **وصحة التكليف**) دروستی رووڵی نانی خودا لەبەندەکانی ( **تعتمد على هذه الإستطاعة** ) پشت دەبەستیٚ لەسەر ئەو " إستطاعة" یە واتە:ساغ و بیٚ گەردی ئەسباب ئالاتەکانی ( **ولايكلف العبد بما ليس في وسعه** ) روو لەبەندەنانرێت بەوەی کەلە توانایدا نەبێت ، وەك خودا دەفەرموێت : ﴿ لايكلف الله نفسا إلا

(٨٩) : شرح رمضان افندي : ٢٠٠ و٢٠٥ وشرح العقائد النسفية: ١٤٦ –١٦٣ .

وسعها﴾ [٤٢] خودا تەكليف ناكات لەهيچ نەفسێك ئيلا لەو كردەوانەى كەوان لەتاقەتياو دەتوانێت بەجێيان بێنێت يا نەيكات.

( **وما يوجد من الألم في المضروب عقب ضرب إنسان** ) ئەوەى دەست دەكەوێت لەئازار لە لێكدراوەكەدا پاش لێدانى ئادەميزادێك ( **والإنكسار في الزجاج عقب كسرِ إنسان** ) وەقبول كردنى شكاندن لەو شوشەدا پاش شكاندنى ئەو شوشەيە لەلايەن ئادەميزادێك _ ( **وما أشبهَهُ** ) ئەوەش وەك ئەو وابێت وەك مردن پاش كوشتن , ( **كل ذلك مخلوق لله تعالى** ) هەموو ئەمانە دروستكراوو پاشماوەى كردارى زاتى خودان ( **لاصُنع للعبد في تخليقة** ) پيشەى بەندە نييە لەدروستكردنيدا.

( **والمقتول ميت بأجله** ) كوژراو دەمرێت لەوكاتەدا ديارى كراوە بۆ مردنى ( **والموت قائم بالميت** ) مردن دەوەستێت بەو مردووەوە, ( **مخلوق لله تعالىلا صنع للعبد تخليقا ولا إكتساباُ** ) دروستكراوى خودايە دروستكردنى بەندە نيە لەمردندا نە لە رووى

**والأجل واحد**

---

دروستكردنەوە وەنە لەرووى دەزگير ( إكتساب) ەوە, بنچيەى بونى مردن كەوەستاوە بەمردووەوە لەسەر ئەوەيە كەمردن "وجودي" يە بە فەرموودەى خودا ﴿خلق الموت والحياة﴾ [٤٣]، خودا دروستى كردووە

---

(٩٠) : سورة البقرة :٢٨٦ .

(٩١) : سورة الملك:٢ .

مـردن و ژیـان . وەزۆربـەی ئـەهلی سـوننەت لەسـەر ئـەوەن کـەمردن "عدمي" یە و نەبووە لەدەرەوە وەنەوەستاوە بەمردووەوە.

( **والاجل واحـد** ) ئەو کاتـەی کـە دیاری کراوە بـۆ مـردن یەکێکە . ئەهلی سوننەو جەماعەت لەسەر ئەوەن کەئەجەل یەکێکە نەدوادەکەوێت و نەپێش دەکەوێت , وەبەرگری نیە لەجیاوازی هۆکانی مردندا .

بەراسـتی کـوژراو دەمرێـت بـەو کاتـە دیـاری کـراوەی , وەئەگـەر بکوژەکەیش نەبێت دروستە لەو کاتەدا بمرێت . بەراستی خودا مـردن و ژیانی دروست کردووە لەکوژراوەکەدا نەك بکوژ .

وەبەڵگەیان هێناوەتەوە بەمانە:

١ – خـودا دەفـەرموێت ﴿ فـاذا جـاء أجلهم لا يستأخرون سـاعة ولا يستقدمون﴾[٤٤] واتـە: کاتێـك ئەجـەلیان هـات نـەدوا دەخرێـت نـەپێش دەخرێت سەعاتێك .

٢– خـودا دەفـەرموێت :﴿ ولـن يؤخر الله نفسا إذا جـاء أجلها ﴾[٤٥] واتە: کەسێ ئاکامی هات ئیتر خودا هـیچ مۆڵـەتی نـاداو مردنەکـەی دوا ناخات.

---

(٩٢) : سورة اعراف ٣٤ .

(٩٣) :سورة المنافقون ١١:

٣ - خودا دەفەرمویێت:﴿ الله يتوفى الأنفس حين موتها ﴾[٤٦] واتە: خودا گیانی گیانلەبەر وەردەگرێت پەیوەندی دەبرێت لەلەش لە ئاسکرا و پەنامەکیدا لەکاتی مردنی ئەواندا.

..................................................

---

کەعبی کە یەکێکە لە زاناکانی موعتەزیلە دەڵێت : بەراستی کوژراو دووکاتی دیاری کراوی بۆ مردن هەیە :

یەکەم : کوشتن .

دووەم : مردن بێ گومان بکوژ ئاکامی کۆتایی پێدێنێت .

وەئەگەر ئەو بکوژە نەیکوشتایە دەژیا تاکاتێکی تر کە ئەویش – مردنەکەیە– بەراستی بکوژەکە مردنی دروستکردووە لەکوژراوەکەدا , لەبەر ئەوەی لە لایەنی ئەوەوە مردنەکە رووی داوە بەئارەزووی .

وەئەم بەلگانە دێنێتەوە :-

١ - ئەو دەقانەی کەهاتوون لەوەی هەندێك طاعەت تەمەن زیاد دەکات , وەك فەرموودەی خودا کەدەیگێڕێتەوە لەحەزرەتی نوحەوە : ﴿ أن اعبدوا الله واتقوه وأطيعوني يغفر لكم من ذنوبكم ويؤخركم الى أجل مسمى ﴾[٤٧] واتە: بەندەیی بۆ خودابکەن و لەخودا بترسن و

---

(٩٤) : سورة الزمر :٤٢

(٩٥) : سورة نوح :٣

فەرمانبەرداری من بکەن , خودا لەگوناهەکانتان خۆش دەبێت وتاوانتان دەبەخشێت و لەناوبردنتان دوا دەخات بۆ کاتێکی ناوبراو.

٢ – پێغەمبەر(دروودی خودای لە سەر بێت) دەفەرموێت : ( من أحب أن يبسط عليه في رزقه وينسأ له في أثره فليصل رحمه )[٤٨] واتە : هەرکەس پێ ی خۆشە کەرزق و رۆزی زیاد بێت وەکاتی مردنی دوا بخرێت .

بادیەدەنی خزم و کەس و کاری بکات . هەموو ئەمانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی بۆ هەموو ئادەمیزادێك دووکاتی مردنی هەیە , ئەگەر وانەبووایە رێتێچونی زیادو کەمی نەدەبوو.

وەبەڵگەش دێننەوە بەوەی : بەراستی بکوژەکە ئەگەر کاتی مردنی کوژراوە کەکۆتایی پێنەهێنێت شیاو نەدەبوو بۆ سزا لەبەر ئەوەی مردووە کوژراوەکە مردووە بەکاتی مردنی خۆی .

.....................................................................

---

**وەڵام دراوەتەوە لەبەڵگەی یەکەم : زیادەی تەمەن چەند ئیحتمالاتێکی هەیە :**

١- مەبەست بەزیادەی تەمەن مەجازییە واتە فەرو بەرەکەت دەخاتە تەمەنی بەشێوەیەك چەند کردارو بەرهەمێك ئەنجام دەدات کەناتوانێت تەمەن درێژێك بەئەنجامی بهێنێت . کاردەکات لەو تەمەنەی کەپەنجا ساڵە لەوەی کە لە سەد ساڵدا بکرێت .

---

(٩٦) : رواه المسلم.

٢- بەراستی خودا نوسیویەتی ـە ( لـوح المحفوظ) دا , تەمـەنی فلاّنە کەس چل ساڵە خودا دەزانیٚ لە پاشا دیدەنی خزمێکی دەکات یا خێر دەکات دەبێت بەشەست ساڵ – دوای دەخات بۆشەصت ساڵ ئەوە مەبەستە بە فەرموودەی خودا : ﴿یمحو الله ما یشاء ویثبت وعنده أم الکتاب﴾[٤٩] خودا هەرکیتابیٚ ویستی لای بباو کاری پێنەکرێت لای دەبا وەهەر کیتابیٚ خواستی وابیٚ دەوامی پیٚ بدات دەوامی پیٚ دەدات , وەسەرچاوەی هەموو کتێبەکانی لایە کەناوی ( لـوح المحفوظ) ە و هەموو کیتابەکان لەناوی دا نوسراون .

٣- باس کردنی بەچاکە لەدوای مردنی وەك نەمردبێت وایە .

وەلاّمیش بۆ بەڵگەی دووەمیان :

ئەو پیاوە بکوژە شیاوی سزایە نەك لەبەر ئەوەی مردنی دروست کردووە لەکوژراوەکە بەڵکو لەبەر ئەوەی تاوانێکی کردووە . ئێمە بروامان وایە کە خودا مردن دروست دەکات لەکوژراوەکە وەئەو مردنە پەیدا نابێت لەکوشتنی بکوژەکەوە ، لەفەرموودەی خودا : ﴿ خلق الموت والحیاة ﴾ خودا مردن و ژیانی دروست کردووە . ئەو ئەلف ولامەکە بەسەر ووشەی ( الموت ) وەیە بۆ ئیستیغراقە هەموو جۆرە مردنێك داگیر دەکات هەچەند جیاواز بێت هۆکارەکانی .

## والحرام رزق وكل يستوفي رزق نفسه حلالا كان أو حراما ولايتصور أن لايأكل انسان رزقه أو يأكل غيره رزقه

---

(٩٧) : سورة الرعد :٣٩ .

( والحــرام رزق ) حـەرام واتــە: ئـەو مالــەی لەرێگــەی شــەرعیەوە دەســت نەکـەوێت , رۆزییـە ( وکـل یـستوفيَ رزق نفـسه ) هـەموو یـەکێك لەئادەمیزاد رۆزی خۆی وەردەگرێت بەتـەواوی ( حـلالا کـان أو حراما) ئەو رزق و رۆزیە حەرام بێت یان حـەلال . ( ولایتـصور أن لایـأکل انـسان رزقه ) ناگونجێت ئادەمیزاد رۆزی خۆی نەخوات ( أو یـأکل غـیره رزقـه ) یـا جگـە لـەو ئـادەمیزادە کەسـێکی تـر رۆزیەکـەی بخـوات واتـە : ئـەو بەشـەی کـە خـودا بـۆی دیـاری کـردووە نـە کـەس دەتوانێـت بیخـوات نـە ئەویش دەتوانێت بەشی کەسی تر بخوات .

**لای موعتەزیلەکان:مالی حـەرام رۆزی نیە،لەبـەر ئـەوەی تەفـسیری رۆزیـان کردووە بە دووشێوە :**

١ – ( مملوك ) بوو بەمولك وەخاوەنەکەی دەیخوات لەسەر ئەمە:

٢– حـەرام مولْـك نیـەو رۆزیـش نیـە.ب– رۆزی قەدەغـە نیـە سـوود وەرگرتن لیٚ ی . حەرام قەدەغەیە سوود وەرگرتن لـیٚ ی کەوابوو حـەرام نابێت بەرۆزی .

وەهەروەها ئەم مەزهەبە ئەم دوو خاڵەی ترش ئاماژەی پیٚ دەدەن و دەڵێن :

أ- رزق ورۆزی فە دەکرێت بۆ لای خودا . رۆزی دەر نیـە جگـە لەخودا وەحەرام شتێکی ناشیرینە نابێت بەرۆزی تا نیسبەت بدرێت بۆ لای خودا.

ب –بەنــدە توشــی لۆمــە دەبێــت بــەخواردنی حــەرام . وە رۆزی نیـسبەت دراوە بـۆ لای خـودا وەئەگـەر حـەرام رۆزی بووایـە ئـەوەی دەیخوارد نەدەبوو لۆمە بکرێت سزا بدرێت لەسەری لەبەر ئەوەی رۆزی نیسبەت دەدرێت بۆ لای خودا .

ئەهلی سوننەت بروایان وایە کەرزق و رۆزی حەرام و حەلال دەبێت . لەبەر ئەوەی تەفسیری رزقیان کردووە بەوەی کەناوە بۆ ئەو شتە کە خودا ناردوویەتی بۆ گیاندارو دەیخوات .

وەلامی موعتەزیلەشیان بۆ رزق و رۆزی بەمانەی خوارەوە داوەتەوە :-

١ - موعتەزیلە دەلێن : رزق مولکە بۆ ئەوەی دەیخوات . دەبوایە گیاندار روزی نەبوایە لەبەر ئەوەی خاوەن نیە بۆ ئەوەی دەیخوات , وەروزۆیش دراوە وەئەوەش دەیخوات رزقە .

**والله تعالى يضل من يشاء ويهدي من يشاء و ما هو الأصلح للعبد فليس بواجب على الله تعالى**

---

٢- بەپێویست دەگەرێت لەسەرموعتەزیلە کەسێك ماوەیەکی زۆر ژیاو مرد وەمالی حەلالی نەخوارد ئەوەخودا رۆزی نەداوە , ئەمەش بەتالە بەفەرموودەی خوا

﴿ وما من دابة إلا على الله رزقها﴾[٩٨] واتە: هیچ گیانلەبەرێك نیە بروات بەسەر زەویدا ئیلا ژیواری لەسەر خودایە .

گیاندارو ئەوەی حەرام دەخوات هەردووکیان بەشدارن لەگشتیەتی ئەم ئایەتەدا , وەهەردووکیان رۆزی دراون

٣ - ناشیرن نیە کرداری هیچ شتێك کەنیسبەت بدرێت بۆ لای خودا , لەبەر ئەوەی خودا ئیش و کاری بەئارەزووەو هەرشتێك ئارەزووی بێت دەیکات , وەجوان و ناشیرینی کار بۆ ئیش کەرەکەیە

(٩٨) : سورة الهود : ٦

نەك بۆ زاتی خودایە, کەوابوو زیانی نیە نیسبەتدانی ریزقی حەرام بۆ لای خودا .

٤- ئەوکەسەی رۆزی حەرام دەخوات شیاوی لۆمەو سزایە . لەبەر ئەوەیە کاری خراپی کردووە بەئارەزووی خۆی لەبەرئەو خراپە لۆمەو سزادەدرێت نەك لەبەر ئەوەی رۆزیەکە حەرامە[٥١] .

( **والله تعالى يضل من يشاء** ) خودا دای دەنێت و پەیدای دەکات گومرایی لەکەسێك دا خودا بیەوێت گومرایی بکات ( **ويهدي من يشاء** ) وەدەست دەکەوێت هیدایەت بۆ کەسێك بیەوێت هیدایەتی بدات . بەراستی خودا گومرایی دروست دەکات لەئادەمیزاددا لەدوای ئەوەی ئادەمیزادەکە نیازی گومرایی کرد لەهۆکانی گومرایی و رووی تێکرد . وە خودا هیدایەت دروست دەکات لەئادەمیزاددا لەدوای ئەوەی ئادەمیزادەکە نیازی هیدایەتی کرد لەهۆکانی هیدایەت و رووی تێکرد .

( **وما هو الأصلح للعبد** ) ئەوەی چاکتر ( اصلح) بێت بۆ بەندە( **فليس بواجب على الله تعالى** ) لەسەر خودا پێویست نیە .

.........................................................

---

ئەهلی سوننە بروایان وایە کەواجب نیە لەسەر زاتی خودا شتێك لەو شتانە , لەبەر ئەوەی ( وجوب) پێویست حوکمێکە لەحوکمەکان , وەحوکم بەشەرع نەبێت نابێت وەحوکم بەسەر خوداوە نیە وەحاکم نیە بەسەریەوە وپێویست نیە هیچ شتێك بەسەرزاتی خوداوە .

---

(٩٩) : شرح العقيدةالنسفية: ١١٩ –١٢٠ و شرح العقائد: ١٧٠ –١٧٢ .

## بەشـــی سێهـــەم :

## لە چۆنییەتی دواڕۆژدا : ئەمانەی لە خۆ گرتووە :

( ١ ) پرسیاری گۆڕ و سزا و خۆشی .

( ٢ ) زیندووبوونەوە .

( ٣ ) کیشانە و ترازو .

( ٤ ) بەخشینی نامەی کردەوەکان .

( ٥ ) پرسیاری مەحشەر .

( ٦ ) حەوزی کەوسەر .

( ٧ ) پرد ( صراط ) .

( ٨ ) بەهەشت و دۆزەخ .

( ٩ ) گوناهی گەورە مسولمان ناهێڵێتەوە بە هەمیشەیی لە ئاگردا .

( ١٠ ) خۆش بوون لە گوناە جگە هاوەڵدان بۆ خودا .

( ١١ ) ئیماندار بە هەمیشەیی نامێنێتەوە لە ئاگر .

## وعـذاب القـبر للكـافرين ولـبعض عـصاة المـؤمنين وتنعـيم أهـل الطاعة في القـبر بمـا يعلمـه الله ويريـده وسؤال منكـر ونكـير ثـابـت بـالدلائل السمعية

(**وعذاب القبر للكافرين ولبعض عصاة المؤمنين** ) سزای ناو گۆڕ هەیە بۆ كافرو هەندێك لە گوناهبارانی باوەڕدار كەمردبێت پێش گەرانەوەیان بۆ لای خودا واتە: حەشر با لەناو دەریادا یا لەناو سكی درندەدابێت ( **وتنعيم أهل الطاعة في القبر بما يعلمه الله ويريـده** ) هەروەها هەیە نازو نیعمەت و خۆشی لەناوگۆڕدا بۆ كەسانی خودا پەرست بەوەی خودا دەیزانێت و دەیەوێت .

( **وسؤال منكـر ونكـير** ) وە پرسیار كردنی مونكەر و نەكیر كەدوو فریشتەی زۆر بەسام و هەیبەتن و مردووەكە لەقەبرەكەیدا دادەنیشێنن و پرسیاری لێدەكەن , خودای تۆ كێ یە؟ پێغەمبەرت كێ یە؟ئیمامت كێ یە؟ قیبلەت كوێ یە ؟ .... ( **ثابت بـالدلائل الـسمعية** ) هەموو یەكێك لەوانە چەسپاوە بەبەڵگەی سەمعی كە وەرگیراون لەقورئان و سوننەت .

بەڵگە لەسەر سزای ناو گۆڕ خودا دەفەرموێت ﴿ وحاق بآل فرعون سوء العذاب النـار يعرضـون عليهـا غدواً وعـشيا. ويـوم تقـوم الـساعة أدخِلوأ آل فرعون اشد العذاب﴾ (٥٢) واتە: داروودەستەی فیرعەون سزا دەدرێـن بەسـزایەكی زۆر نابـار بـەم شـێوە كـە بـەیانی و ئێـوارە را

(١٠٠) :سورة غافر أية :٤٥ .

ئەنوێنرێن بە سەر ئاگرداو، لەرۆژی قیامەتیشدا فریشتەی بەرپرسیاری سزا بانگ دەکرێت و پێی دەوترێت: گەلی فیرعەون بخەنە ناو سزایەکی زۆر سەختەوە لەهەموو سزاکان بەتینتر بێت .

خودا لەبارەی گەلی نوحەوە دەفەرموێت :﴿ أغرقوا فأدخلوا نارا﴾ [٥٣] پیتی فا لە(فأدخِلو أ) بۆڕیز و بەدوا هاتنە بە بێ دوا کەوتن ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوە خراو نەتە ناو ئاگرەوە لەدوای خنکاندنیان ئەمەش لەگۆڕدا دەبێت. واتە : بەئاوی لافاو خنکێنراون وگورج خراونە ناوئ ئاگری بەرزەخەوە .

پێغەمبەر ( درودی خودای لە سەر بێت ) دەفەرموێت :( استنزهوا من البول فإن

**والبعث حق**

---

عامة عذاب القبر منه )[٥٤] واتە: خۆتان پاك بكەنەوە لە پاش ماوەی میز بەراستی زۆربەی سزای گۆر لەهۆی ئەوەوەیە .

پێغەمبەر (درودی خودای لە سەر بێت ) دەفەمویێت ( القبر إما روضة من رياض الجنة أو حفرة من حفر النار)[٥٥] گۆر یا باخێکە لەباخەکانی بەهەشت یان چاڵێکە لەچاڵەکانی دۆزەخ. پێغەمبەر(درودی خودای لە سەر بێت ) دەفەرموێت:ئایەتی ﴿ يثبت الله الذين أمنوا

---

(١٠١) : سورة نوح أية : ٢٥ .

(١٠٢) :رواه الدار قطني.

(١٠٣) :رواه الترمذي.

بـالقول الثابـت ﴾[٥٦] هاتـه خـوارەوە لـه سـزای قـەبردا ، واتـه : خـودا دامەزران دەدات بەوانە ئیمانیان هێناوە بەدینی ئیسلام بەهۆی تەلـەفوظ کردنیان بەو وتەیە کەدامەزراوە بە بەڵگە کاتێك وترا بەمردووەکە خوای تۆ کێیە؟

دینت چی یە ؟ پێغەمبەرت کێیە ؟ ئەگەر بەختـەوەر بیت دەڵێت : خـودام ( الله)یـە, ئـاینم ئیـسلامە , پیغەمبـەرم موحەممـەدە هەنـدێك لەموعتەزیلە و رەوافیض ئینکاری سزای ناوگۆریـان کردووە , وتویانـە مردوو بێگیانە و هەستی نیە و سزادانی شتێکی مەحاڵە .

وەڵام دانەوە: بێگومان دروستە خودا لەهـەموو ئەندامی مردووەکـە دا یا لەهەندێکیدا جۆرە ژیانی دروست بکات بەگوێرەی هەسـتکردن و دەرککردنـی ئـازاری مردن و خۆشـی نـازو نیعمـەت , ئەوە بـە پێویـستی ناگـەرێنی گەرانـەوەی رۆح بـۆ لاشـە یـا خـود جولانـدن یـا لـەرزەیا پاشمـاوەی سـزای پێوە دیـاربێ هـەتا ئـەوەی خنکا بێـت لـە ئـاودا یـا گیاندار خواردبێتی یا هەلواسرابێت سزا بدرێت و ئێمـە ئاگـادار نـەبین بەسەیدا.

ئەو کۆمەلە حەدیسانەی هاتوون لەم ماناداو, وەلەزۆر لەحالـەتی دوا رۆژدا موتەواتیرن لەماناداو با حەدیسە ئاحادەکانی نەگەیشتبێتە رادەی تـەواتور ( **والبعـث حـق** ) زیندووبوونـەوە راسـتەواتە: خـودا مردووەکـان زیندوودەکاتـەوە لـەگۆرەکانیان بەهـەموو ئەندامـە ئەصـلیەکانیانەوە رۆحیشیان بۆ دەگەرێتەوە ,

---

(١٠٤) : إبراهيم أية : ٢٧ .

خـوا دەفـەرموێت ﴿ ثـم إنكـم يـوم القيامـة تبعثـون ﴾[٥٧] واتـە: پـاش تـەواو بـوونی مـاوەی بەرزەخ بەراسـتی ئێـوە زیندوودەکرێنـەوە لـەرۆژی قیامەتدا .

وەخـودا دەفـەرموێت : ﴿ قـل يحييهـا الـذي أنـشأها أول مـرة ﴾[٥٨]

واتـە: ئـەی خۆشـەویـست تـۆ پێـی بلـێ : ئـەو پـەروەردگارە زینـدووی دەکاتەوە کەیەکەم جار لەنەبوون دروستی کرد . پێغەمبەر دەفەرموێت:

( يحـشر النـاس حفـاة عـراة غـرلا - يعنـي بـلا ختـان - علـى الخلقـة الأصـلية قالـت عائشة يارسـول الله الرجـال والنـساء ينظـر بعـضهم الـى بعض فقال ياعائشة الأمر أشد من أن ينظر بعضهم إلى بعض)[٥٩] واتـە:

ئادەمیزاد حـەشر دەکرێت بەپێی پەتی بەرووت وقوتی سوننەت کـراوی لەسـەر دروسـت کردنـی ئەصـلی . حـەزرەتی عائیـشە عـەرزی پێغەمبـەر (سڵاوی خودای لە سەر بێت) کـرد : فـەرمووی ئـەی پێغەمبـەری خـودا ژن و پیـاو هەنـدێکیان سـەیری هەنـدێکیان دەکـەن فـەرمووی : عائیـشە وەزعەکـە لەوەسـەختترە کەهەنـدێك سـەیری هەنـدێك بکـات . فەلاسـیفەدەڵێن : لاشـەی مـردوو حەشـر ناکرێـت بـەڵکو روح حەشـر دەکرێـت کاتێـك ئـادەمیزاد دەمرێـت دەبێـت بەنـەبوو , دروسـتکردنەوەی شـتی نـەبوو بەشێوەی خۆی مەحاڵە .

(١٠٥) : سورة المؤمنون :١٦ .

(١٠٦) : سورة يس أية : ٧٩

(١٠٧) : رواه مسلم .

وەڵام دراوەتەوە: بێگومان ئەوەی بەتوانا بێت لەئاو ئادەمیزاد دروست بکات بەتواناشە دروستی بکاتەوە بەشێوەی خۆی بەڵکو دروستکرنەوەی دووەم جار ئاسانترە گەورەترین بەڵگە بە چاوی خۆمان دەبینین ئەو گژ و گیا و رووەکانەیە کە وشك دەبن و یەك دوو وەرزیان بە سەردا تێدەپەڕێ و ئەنجا سەوز دەبنەوە .

( **والوزن حق** ) کێشانەی کردەوەکان لەرۆژی دوایدا گومانی تێدا نییە خودا دەفەرموێت :﴿ والوزن يومئذ الحق﴾ [١٠٨] واتە: کێشانەی کردەوەی خاوەن روو لێنراوەکان لەو رۆژەدا لەئادەمیزادو پەری گەورەو بچووك داراو نەدار هەموو راستە .

## والكتاب حق

دەگێرنەوە لەئیبن و عەبباسەوە فەرموویەتی : ( توزن الحسنات والسيئات في ميزان لـه لِسان وكفتان توضع فيه أعمالهم...) چاکەو خراپەکان دەکێشرێت لەتەرازوویەکدا کەزوباو دوو لەپی هەیە کردەوەکانیان دەخرێتەناوی. ووشەی ( ميزان) تەرازوو بریتی یە لەو شتەی ئەندازەی کردەوەکانی پێ بزانرێت , ژیری ناگات بەو دەرکی چۆنیەتی بکات .

موعتەزیلە ئینکاری کێشانەی کردەوە دەکەن چونکە کردەوەکان ( أعراض ) پەیدابوون ناگونجێت دووبارەبوونەوەی لەبەر ئەوەی هەلوەشاوەتەوە, خۆ ئەگەر بگونجێت دووبارە بوونەوە ناگونجێت کێشانەی چونکە کردەوەکان لای خودا زانراوە کێشانەی بێ سوودە.

---

(١٠٨) : سورة أعراف أية : ٨

وەلاَم دانەوەی : کێشانەی کردەوەکان لەفەرمووودەی پێغەمبەر(دروودی خودای لە سەر بێت ) هاتووە بێگوومان پەرتووکی کردەوەکان دەکێشرێت نەك کردەوەکان , هیچ خراپەنیە , لەسەر ئەوەی دانای تەسلیم بوون , بوونی کردەوەکانی خودا موعەلەلە بە مەبەستەوە , لەوانەیە کێشانە حیکمەتێکی تیادابێت و ئێمە ئاگادار نەبین بەسەریا ئاگاردار نەبوونی ئێمە بەسەر حیکمەتەکەیدا بێکەلکی ئەو شتە ناگەیەنیٚ (٦١) .

( والكتــاب حـق ) حەقە راستە ئەو پەرتووکەی کەنووسرابێتەوە تیایدا کردەوەی چاك و خراپ کەدەدرێت بەدەستی راستی باوەڕداران وەدەدرێت بەدەستی چەپ یا لەپشتەوە بەکافران , خودا دەفەرموێت : ﴿ ونخرج له يوم القيامة كتابا يلقاه منشورا﴾ (٦٢) واتە: لەرۆژی قیامەتدا کتێبێکی تایبەتی کەپر کراوەتەوە بەو کردەوانە بۆی دەردەکەین , هەرکەسیٚ دەگا بەو کتێبی خۆیە بە بلاوی و بەتەواوی .

وەدەفەموێت: ﴿ فأما من أوتي كتابه بيمينه فسوف يحاسب حسابا يسيرا﴾ (٦٣) ئەو کەسەی کەنامەی کردەوەی درایە دەستی راستی ئەوسا پرسینەوەیەکی سوك و ئاسانی لەگەلدا دەکرێت . بەلاَم موعتەزیلە ئینکاری نامەی کردەوەدەکەن هەندێکیان گومانیان وایە بێسوودە لەبەر ئەوەی خودا زانایە بەدرێژەی کردەوەکانی بەندە.

## والسؤال حق والحوض حق

---

(١٠٩) : شرح العقائد النسفية : ١٨٤ .

(١١٠) : إسراء أية : ١٣.

(١١١) : سورة إنشقاق أية : ٧, ٨ .

**حیکمەتی ئەم نامەی کردەوە ئەوەتە کە بەرزی پایەی موسولمانان لای ئەهلی عەرەصاتِ دەردەکەوێت و بەم پایە بەرزییە شادمان بن ، هەروەها نزمی و بێ ئابرووی خراپەکارەکان دەردەکەوێت و ئەوانیش سەردابخەن وشەمەزار بن ، ئەگینا خودا بەهەموو ئاشکراو نهێنیەك دەزانێت وئەوەندەی تۆسقالێکی لێ وون نابێ**[64] .

( **والسؤال حق** ) **پرسیار کردن لەرۆژی قیامەتدا لەلایەن خوداوە لەبەندەکانی راستە . خودا دەفەرموێت** ﴿ إن الذين يضلون عن سبيل الله لهم عذاب شديد بما نسوا يوم الحساب ﴾ [65]**واتە : بەراستی ئەوانەی رێگەی خودا وون دەکەن خودا سزایەکی سەختی بۆ داناوون بەهۆی فەراموش کردنی رۆژی حیساب ورۆژی کێشانە کردنەوە .**

**پێغەمبەر**(دروودی خودای لە سەر بێت ) **دەفەرموێت:** ( لاتزول قدما عبدیوم القيامة حتى يسئل عن أربع عن عمره فيما أفناه , وعن جسده فيما أبلاه , وعن علمه فيما عمل به , وعن ماله من أين أكتسبه وفيما أنفقه ) [66] .

**واتە : لەرۆژی دواییدا کەس پێ ناخاتە بەر پێ تا لەچوار شت پرسیاری لێنەکرێت لەتەمەنی لەچیا تەواوی کردووە, لەلاشەی لەچیا لەناوی بردووە , لەزانیاری لەچیا کاری پێکردووە , لەمالی لەکوێوە دەستی کەوتوەو لەچیا سەرف کردووە (** **والحوض حق** **) حەوزی (کوثر) راستە , خودای گەورە مژدە بە پێغەمبەرەکەی (درودی خوای لە سەر**

---

(١١٢) : عقیدەی مەرضیە ل :٦٢٣ .

(١١٣) : ص: أية ٢٦ .

(١١٤) :رواه الترمذي.

بێـت ) دەدات و دەفـەرموێت ﴿إنـا أعطينـاك الكـوثر ﴾[٦٧]واتـە ئێمـە (كوثر) مان دا بە تۆ کەجۆبارێکە لەبەهەشتدا.

پێغەمبـەر(دروودی خودای لە سەر بێت ) دەفـەرموێت ( حوضـي مـسيرة شـهر وزواياه سواء وماءه أبيض من اللبن وريحـه أطيب من المسك وكيزانـه أكثر من نجوم السماء من شرب منها فلا يظمأ أبدا) [٦٨] .

## والـصراط حـق والجنـة حـق والنـار حـق ، وهمـا مخلوقتـان الآن باقيتان لايغنيان ولا يفني أهلهما

واتـە: حـەوزی مـن مانگـە ریگایـەك گـەورەو بـەر فراوانـە , چـوار گۆشەیە , ئاوەکەی لەشیر سپی ترە , لەمیسك بۆن خۆشترە , گۆزەکـانی ئەوەندەی ئەستێرەی ئاسمانن, هەرکەس لێی بخواتەوە هەرگیز تینووی نابێت .

( **والصراط حق** ) پردی مەشهوور بە صیراط راستە , واتە : پریدێکـە راکێـشراوە بەسـەر پـشتی دۆزەخدا لـەتاڵێ مـوو باریـك تـرە و لـەدەمی شمـشێر تیـژترە , ئـەهلی دۆزەخ قاچیان دەخلیـسکێت و دەکەونـە نـاو دۆزەخ .

زۆر لەموعتەزیلـە سەرپێـچیان کـردووە ووتویانـە: ناگونجێـت تـێ پەربوون بەسەریدا, ئەگەر بشگونجێت سزایەبۆ باوەڕداران.

---

(١١٥) : سورة الكوثر أية :١.

(١١٦) : رواه البخاري.

وەڵام: دیارە تواناو دەستەڵاتی خودا بەسەر دروستکردنی پردێکی واو لێ پەرینەوەیدا پایەدارە, سزاو ئازاریش بۆ ئینسانی بەدکردارە , خودا لەسەر باوەڕداران ئاسانی دەکات, هەندێك موسولمان وەك بروسکە و هەندێکیان وەك باو , هەندێکیان وەك سواری ئەسپی رەسەن بەسەلامەتی وبێ ئازار دەپەرنەوە وەك لەفەموودەکانی پێغەمبەردا (دروودی خودای لە سەر بێت ) هاتووە .

( **والجنة حق والنار حق** ) بەهەشت و دۆزەخ راستن ( **وهما مخلوقتان موجودتان** ) هەردووکیان دروستکراون ئێستا هەن زۆربەی موعتەزیلە دەلێن : لەرۆژی دواییدا دروست دەکرێن , داستانی ئادەم وحەوا , دەری دەخات کە مەوجودن وەخوا دەفەرموێت :﴿ أعدت للمتقين﴾ واتە: بەهەشت ئامادەکراوە بۆ خودا پەرستان . "أعدت للكافرين٤ , واتە : دۆزخ ئامادەکراوە بۆ بێ بڕواکان.

( **باقيتان لايفنيان ولايفنى أهلهما** ) دەمێننەوەو لەناو ناچن و دانیشتوانیشیان لەناو ناچێت .

خوا دەفەرموێت لەحەقی هەردوو کۆمەڵەکە" خالدين فيها أبدا " (٦٩)

واتە : تیایدا دەمێننەوە هەتا هەتایی .

**والكبيرة لا تخرج المؤمن من الإيمان ولاتدخله في الكفر**

---

(١١٧) : سورة البينة :٦،٧ .

( **والكبيرة لا تخرج المؤمن من الآيمان** ) **گوناهی گەورە ئینسانی باوەڕدار دەرناكات لەئیمان واتە بیٚ باوەڕ نابیٚت . زاناكان جیاواز یان هەیە لەگوناهی گەورە** ( الكبيرة ) **لە رووی تیٚ گەشتن و ژمارەدا .**

**ئیبن و عومەر ریوایەتی كردووە نۆدانەیە ئەمانەن** ( الشرك بالله وقتل النفس بغير حق وقذف المحصنة والزنا والفرار عن الزحف والسحر واكل مال اليتيم وعقوق الوالدين المسلمين والالحاد في الحرم ) **واتە: هاوەڵ دانان بۆ خودا , كوشتنی كەسیٚك بەبی حەق , هەلبەستنی قسەی ناشیرنن بۆ ئافرەتیٚكی داویٚن پاك ، زینا كردن , ڕا كردن لەغەزا , سیحر , خواردنی مالی هەتیو , ئازاردانی باوك و دایكی موسولمان , گوناهكردن لەحەرەمی كەعبە .**

**ئەبو هورەیرە زیادی كردوە : أكل الربا: سوود خۆر كەواتە لای ئەبو هوریرە گوناهی گەورە دەیە . حەزرەتی عەلی زیادی كرد وە :** (السرقة وشرب الخمر) **. دزی و ئارەق خواردنەوە. كەواتە لای حەزرەتی عەلی گوناهی گەورە دوانزەیە .**

**وتراوە گوناهی گەورە :**( كل ماكان مفسدته مثل مفسدة شيء مما ذكر أو اكثر منه ) **واتە: هەموو شتیٚك خراپەكەی ویٚنەی خراپەی شتیٚك بیٚت لەو گوناهانەی باسكرا یا زیاتر بیٚت .هەروەها وتراوە "كل ماتوعد عليه الشارع " واتە : هەموو شتیٚك خواو پیٚغەمبەر** (سزودی خودای لە سەر بیٚت ) **هەرەشە بكەن لە سەری .**

**وتراوە :**" كل معصية أصر عليها العبد فهي كبيرة " **هەموو گوناهیٚك ئادەمیزاد بەردەوام بیٚت لەسەری ئەوە گوناهی گەورەیە"** وكل مااستغفر عنها صغيرة " **هەموو گوناهیٚك ئادەمیزاد داوای لیٚ خۆش بونی كردبیٚ ئەوە بچوكە.**

( **ولا تدخله في الكفر** ) نایشی خاته ناو کوفرەوە . بەپیچەوانه بۆ خەواریج [٧٠] کە دەڵێن گوناهکاری گوناهی گەورە بەڵکو بچوکیش کافرە واسیطه نیه لە نێوان

**والله لا يغفر أن يشرك به**

---

باوەرو بیٚ باوەرپیدا،لایان باوەرداری گوناهبار نییه باوەرداروبیٚ باوەر هەیه و بەس .

چەند بەڵگەیەکمان هەیه لەسەر ئەوەی باوەردار گوناهی گەورەش دەکات و نابێت بەکافر :

١- باوەڕی راستی شەرعی تەصدیقی قەلبی یە , باوەردار دەرناچێت لیٚ ی بەوەی گوناهی گەورەبکات مانەم بەحەلالی نەزانێت مەگەر بەشتێك بیٚ باوەر دەبێت کەپێچەوانەی باوەر بێت وەکو کوفر کردن.

---

(١١٨) خەواریج ناوە بۆ کۆمەڵێکی سیاسی ئاینی کەدەرچوون لەخەڵکی یا لە راستی دەرچون یا لەگوێرایەلی حەزرەتی عەلی ئەوانە ئیددعای ئەوەدەکەن هۆی ناونانەکەی ئەوەبوو دەرچوون بۆ غەزا وەناودەبرێن ( حرورية) نیسبەتە بۆ (حروراء) کە گوندێکە نزیك کوفە کۆبوونەوەیان دەکرد تیدا لەدوای دەرچونیان لەجەنگی ( صفين) دا وەناو دەبرێن بە (المحكمة ) لەبەرئەوەی رازی نەبوون بەحوکم کردن ووتویانە حوکم نیە جگە بۆ خودا , وەناودەبرێت بە(الشراة) لەبەر ئەوەی دەیانووت ئێمە خۆمانمان فرۆشتووە بۆ ئایینی خودا , وەناو دەبرێن بە (المارقة ) لەبەر ئەوەی دەرچون لەکۆمەلی موسولمانان .شرح العقيدة النسفية : ١٥٠.

٢- ئايـات و فـەرمودەكانی پێغەمبـەر (دوردی خوای لە سەر بێت) ووشـەی باوەڕدار بەكار دەهێنن بۆ گوناهباری گەورە وەك دەفەرموێت : ﴿ ياأيها الذين آمنوا كتب عليكم القصاص في القتلى ﴾ البقره :١٧٨ واتـه : ئەی ئەو كەسـانەی ئیمانتـان هێنـاوە بـەخودا فـەرز كـراوە لەسـەرتان تۆڵـە لـەهۆی كوژراوەكانـەوە وەدەفـەرموێت :﴿ وإن طائفتـان مـن المـؤمنين إقتتلـوا﴾ الحجـرات : ٩ . واتـە : ئەگـەر دووكۆمـەل لـەخاوەن باوەڕەكـان شەريان لەگەل يەكدا دەكرد .

٣- كۆرای ئوممەت لەسەر دەمـی پێغەمبـەر (درودی خـوای لـە سـەر بێت) تا ئەمرۆ لەسەر ئەوەن كەنوێـژ بكرێـت لەسـەر كەسێك كـەمردبێت لەئەهلی قيبلـە بـەبێ ئـەوەی گەرابێتـەوە بـۆ لای خـودا ، دوعـاو داوای لێخۆشبوونی بۆ دەكەن لەگەل ئەوەش بزانن كەگوناهی گەورەی كردووە , لەدوای يەكبوونيان لەسەر ئەوەی كە دروست نيە نوێـژ كـردن لەسـەر بێ باوەڕ , ئەگەر گوناهكاری گونـاهی گـەورە بـاوەڕدار نەبوايـە نوێـژيان لەسەر نەدەكرد .

( والله لا يغفـر أن يـشرك بـه ) خـودا خـۆش نابێـت كـه هـاوەلی بـۆ دابنرێت . موسولمانان كۆن لەسـەر تۆلەی كوفر ئەگەر ئينسانێك بمرێت لەسەر كوفر خودا لیَ ی خۆش نابێت وەك دەفەرموێت :﴿ إن الله لايغفر أن يـشرك بـه﴾ النـساء : ١١٦ , واتـه: بەراسـتی خـودا خـۆش نابێـت كەهاوەلی بۆ دابنرێت.

هۆكاريان بۆ ئەمە هێناوەتەوە بەمانە:-

١- كوفر كۆتاییه لەتاواندا هەرگیز گومانی حەلالیەتی نیه لابردنی حەرامیەتی , گومانی لێبوردن نیه لەرووی ڕێزگرتنەوە .

**ویغفر ما دون ذلك لمن یشاء ویجوز العقاب علی الصغیرة والعفو عن الكبیرة إذا لم تكن عن استحلال والإستحلال كفر والشفاعة ثابتة للرسل والاخیار في حق أهل الكبائر**

---

٢- كافر باوەڕی وایه كه كوفر ڕاسته و داوای لێ بووردن ناكات.

٣- بەڕاستی كافر نیەتی مانەوەیه لەسەر كوفر ئەگەر هەتا هەتایی بمێنێت , پێویسته پێی بگات ئەو سزایه هاوێنەبێت بەنیەتەكەیەوە .

( **ویغفر مادون ذلك لمن یشاء** ) خۆش دەبێت جگە لەهاوەڵدانان لەگوناهی گەورەو بچوك لەگەل ئەوەی گەرابێتەوە بۆ لای خودا یان نا بۆ هەر كەسێ ئارەزووی بێت .( **ویجوز العقاب علی الصغیرة** ) ڕەوایە سزادان لەسەر گوناهی بچوك ,( **والعفو عن الكبیرة إذا لم تكن عن استحلال** ) لێ بووردن لەگوناهی گەورە ئەگەر باوەڕی وانەبێت حەرام بە حەلال بزانێت ( **والإستحلال كفر** ) حەرام بەحەلال زانین باوەڕی وابێت كوفرە یانی خاوەنەكەی پێی كافر دەبێت . ( **والشفاعة ثابتة للرسل والاخیار** ) بۆ پێغەمبەران و زانایان و پیاو چاكان ( شفاعة ) تكاكردن دامەزراوە ( **في حق أهل الكبائر** ) لەحەقی ئەوانەی خاوەنی گوناهی

گەورەن لەموسولمانان بۆ ئەوەی رزگاریان ببێت لەسزا لەرۆژی دواییدا . بەڵگە لەسەر شەفاعەت ئەمانەی لای خوارەوەیە : –

١- خودا دەفەرموێت ﴿ واستغفر لذنبك وللمؤمنين ﴾ المؤمن : ٥٥ واتە : داوای چاو پۆشیی بکە بۆ خۆت و ئیمان داران . داواکردنی لێبووردنی پێغەمبەر (دروودی خودای لە سەر بێت) بۆ باوەڕداران شەفاعەتە بۆیان.

٢- خودا دەفەموێت﴿ من ذا الذي يشفع عنده إلا بأذنه ﴾ البقره : ٢٥٥ .واتە : ئەوە کێ یە ئەوکەسە کەبتوانێت تکا بکات بە لای ئەوەوە لەبۆ تاوان باران ئیللا بە ئیزنی خۆی نەبێت کەوابوو ئەگەر ئیزن هەبێت تکا دەکرێت .

٣- خودا دەفەرموێت : ﴿ فما تنفعهم شفاعة الشافعين ﴾ المدثر : ٤٨ واتە : سودی پێنەگەیاندن تکای تکاکاران تکا کە هەیە بۆ بێ بڕواکان سوودی نەگەیاند .

٤- پێغەمبەر (دروودی خودای لە سەر بێت) دەفەموێت : ( شفاعتي لأهل الكبائر من أمتي ) رواه أبو داود و الترمذي و ابن حبان واتە تکا کردنی من بۆ گوناهبارانی گوناهی گەورەیە لە ئوممەتمدا .

**وأهل الكبائر من المؤمنين لا يخلدون في النار**

---

٥- پێغەمبەر درودی خوای لە سەر بێت دەفەرموێت ( يَشفعُ الشهيدُ في سبعينَ منْ أهل بيتِهِ ) رواه ئەبو داود واتە : شەهید تکادەکات بۆ حەفتا کەس

لەکەس و کارو خزمانی ، بەلام موعتەزیلە و خەواریج دەڵێن : شەفاعەت دەست نادات بۆ لێ بوردن لەگوناهبار لەبەر ئەوەی گوناهی گەورە شەفاعەت سوودی تیادا نیە , بەڵکو پێویستە گوناهباربگەرێتەوە بۆ لای خودا, بۆ گوناهە بچوکەکان لێ بووردن پێویستە لەلای خوداوە ، ئەگەر خۆی پاراستبێت لەگوناهی گەورە پێویست ناکات بەشەفاعەت , بەلام لای خەواریج ئەو کەسەی گوناهی گەورە دەکات کافرە .

وەبەڵگەیان هێناوەتەوە بەمانەی خوارەوە :

١- خودا دەفەرموێت:﴿ واتقوا يوما لاتجزي نفس عن نفس شيئاو لاتقبل منها شفاعة﴾ البقره : ٤٨ . واتە : خۆتان بپارێزن لەرۆژێك هیچ نەفسێك لەباتی نەفسێك هیچ جۆرە حەقێك ناداتەوە, وەتکا وەرناگیرێت لە هیچ نەفسێکەوە بۆ هیچ نەفسێك .

٢- خودا دەفەرموێت : ﴿ ماللظالمين من حميم ولا شفيع يطاع ﴾ المؤمن : ١٨ . واتە: لەوکات و ساتەدا ستەمکارەکان نە دۆستێکی وەهایان هەیە یارمەتیان بدا نەتکاکاریشیان هەیە کە گوێی بۆ بگیرێت

وەڵام دراوەتەوە بۆ ئایەتی یەکەم : ئەو ئایە تە هاتوەتە خوارەوە لەجولەکەدا کەکافرن دەڵێن ئێمە ئەولادی ئیبراهیمین و خۆشەویستی ئەوین سزا نادرێین لەبەر خاتری ئەو

٣- وەڵامی ئایەتی دووەم مەبەست بەووشەی ( ظالمين ) ( کافرون ) کافرەکانە .

( **وأهل الكبائر من المؤمنين** ) باوەڕدارانی خاوەن گوناهی گەورە ( **لا يخلدون في النار** ) لەناو ئاگری دۆزەخ دا بەهەمیشەیی نامێننەوە . لە پیشەوە باس کرا بێگومان لەعەقیدەی ئەهلی سوننەت و جەماعەت گوناهکاری گوناهی گەورە باوەڕدارە, لەسەر ئەم بنچینەیە ئەگەر گوناهباری باوەڕدار بچێتە ناو ئاگر سزا دەدرێت بەئەندازەی گوناهەکەی, ئومێد هەیە دەربچێت و بڕواتە بەهەشت .

لەدەقدا هاتووە کە بەڵگەیە لەسەر مانەوەی باوەڕدار لەبەهەشتدا یا ڕۆیشتنە ناو بەهەشت یا پاداشت دانەوەی ئەهلی چاکە بەچاکە.

---

خودا دەفەرموێت :﴿ فمن يعمل مثقال ذرة خيرا يره﴾ زلزلە :٧ واتە: هەرکەسێك بەقەی سەنگی مێروولە سورێك چاکەی کردبێت دەیبینێت پاداشتەکەی لەدواروژدا.

گومان نیە کەئیمان لەکۆمەڵیٚ کردەوەی چاکە, کەوابوو پێویستە خاوەنەکەی پاداشتەکەی ببینیٚ ئەمەش ناگونجیٚ لەگەل مانەوەی لەدۆزەخدا بەهەمیشەی .

وەخودا دەفەمویت :﴿ وعد الله المؤمنين والمؤمنات جنات ﴾ التوبە : ٧٤ واتە : خودا وادەی داوە بەموسولمانە ساغەکان کەچەند بەهێشتێکیان پیٚ دەدا .هەرکەس گوناهی گەورەش بکات لەکۆمەلی

باوەڕدارە , کەوابوو دەچێتەبەهەشتەوە لەبەر وادەدانی خودا پێ ی .
لەپاشا مانەوەی باوەڕدار بەهەمیشەیی لە ئاگر دا زیادەیە لەپاداشتدا .
مانەوەی هەمیشەیی گەورەترین تۆلەیە , کەوابوو هیچ جیاواز نەبوو لەسزا داندا لەنێوا ن کافرو باوەڕداری گوناهبار , ئەمەش ناچێتە عەقڵەوە.

موعتەزیلەو خەواریج دەڵێن ئەوەی دەچێتە ناوئاگر یا کافرە یا خاوەنی گوناهی گەورەیەو مردووە بەبێ گەرانەوەی بۆ لای خودا هەردووکیان ئەهلی ئاگری دۆزەخن بەهەمیشەیی . کافر بە کۆیرا ئەهلی دۆزەخە ، خاوەنی گوناهی گەورە باوەڕدار نیە , لەپێشەوە وەلاَم درانەوە[٧١] .

(١١٩) : شرح النسفية في العقيدة الاسلامية:١٦١.

# بەشی چوارەم :

## باوەڕ :-

### ئەمانەی لەخۆ گرتووە :

- لێکدانەوەی باوەڕ
- ئایا باوەڕ زیاد و کەم دەکات؟
- ئایا ئیسلام و باوەڕ یەکێکن ؟
- کۆتایی ئادەمیزاد لەدونیادا.

## والإيمان : هو التصديق بما جاء به النبي (صلى الله عليه وسلم) من عند الله تعالى والاقرارُ به

(**والإيمــان**) بـاوەڕ , ئيمـان لـەزمانی عەرەبیـدا : بـاوەڕکردن و وەرگرتنە . ئیسلام لەزمانی عەرەبیدا : گـەردن کەچـی و زەلیلیـە . بەلام لەزاراوەی زانایانی عەقائیدا: ( **هو التصدیق بما جاء بـه الـنبي** (صلى الله عليه وسلم) **من عند الله تعالى والاقراربـه** ) باوەڕ وەرگـرتنی دلـە . بۆ ئـەو راسـتیانەی کـە پێغەمبـەر (دروودی خودای لە سەر بێت) لای خـواوە هێنـاونی ئیقرار کردن پیێ بەزمان .

هەنـدێك لـەزاناكان فەرموویانـە : ئیمـان بـاوەڕە بـەدڵ و ئیقـرارە بەزمان .

وەجمهوری زاناکان فەرموویانە : ئیمان باوەڕە بەدڵ, ئیقرار بـەزمان مەرجە بۆ جێ بەجێ کردنی حوکمـەکان لـەدنیادا بێگومـان باوەڕ کـردن بەدڵ فەرمانێکی دەرونیە و کەس ئاگادار نیە بەسـەریدا بـەلام پێویسـتە نیـشانەی ببێت , هەرکـەس بـاوەڕ بکـات بـەدل و بـەزمان ئیقـرار نـەکات ئەوەلای خودا ئیمانداره با ئیماندار نـەبێت لەئـەحکامی دنیـادا. کەسـێك ئیقـــرار بکـــات بـــەزمان و بـــەدڵ بـــاوەڕ نـــەکات وەك دوو روو ئـــەوە بەپێچەوانەوەیە.[٧٢] .

(١٢٠) : — , شرح العقائد النسفية: ٢٠٣, ٢٠٤, ..

هەندێکی تر فەرموویانە : ئیمان باوەڕکردنە بە دڵ و ئیقرار کردنە بەزمان و کردەوەکردنە بەروکنەکان .

موعتەزیلە و خەواریج وتویانە : کردەوە روکنی سەرەکیە لەئیماندا. لەبەر ئەوەی لای ئەمان هەرکەس روکنێکی لەئەرکانی ئیسلام جێ بەجێ نەکات یا گوناهێکی گەورە بکات ئەوە کافرە و ئیماندار نیە .
بەلام جومهوری موتەکەلیمین و موحەدیسین و فوقەها و دووبارە نەقل کراوە لەشافیعیش فەرموویانە: کردەوەکان روکنە بۆ ئیمانی کامل نەك بنچینە بێت بۆ ئیمان .

کەوا بوو کەسێك کردەوەی چاك نەکات ئیمانەکەی ناتەواوە و کەسێك کردەوەی چاك بکات ئیمانەکەی کامل وتەواوە...[٧٣]

## أما الأعمال فهي تتزايد في نفسها والأيمان في نفسه لايزيد ولا ينقص

---

### ئەمە چەند ئایەت و حەدیسێکە رای جومهور بەهێز دەکات:

١- خودا دەفەرموێت:﴿ اولئك كتب في قلوبهم الأيمان﴾ المجادلة "٢٢" واتە : ئەوانە خودا لەدلیاندا نوسیوەتی ئیمان . ئەمە بەڵگە یە لەسەر ئەوەی ئیمان جێگاکەی دڵە .

(١٢١) : شرح النسفية في العقيدة الاسلامية:١٦٥و١١٦ .

٢- **خودا دەفەرموێت** ﴿ إلا من أكره وقلبه مطمئن بالإيمان ﴾[٧٤] .

**ئەگەر ئیقرار روكن بوایە بۆ ئیمان ، ئەو كەسەی زۆری لێبكرایە بەكوفر كردن كافر دەبوو .**

٣- **خودا دەفەرموێت** ﴿ ولما يدخل الإيمان في قلوبكم﴾[٧٥] **واتە : هێشتا باوەڕ نەرۆیشتووەتە ناو دلتانەوە.**

٤- **پێغەمبەر** (درودی خودای لە سەر بێت **دەفەرموێت** ( يامقلب القلوب ثبت قلبي على دينك) راوه الترمذي.

٥- **پێغەمبەر** (درودی خودای لە سەر بێت **فەرمووی بە ئوسامە لەكاتێكدا ئوسامە لەغەزا پیاوێكی كوشت ناوی مەرداسی كوری نەهیك لەئەهلی فەدەك بوو كەوتبووی** : لاإلـه إلا ألله : **بۆ چی ئەو پیاوەت كوشت؟ ئوسامە عەرزی كرد زانیم كە بەدل نەیوت لا الە الا الله پێغەمبەر** (درودی خودای لە سەر بێت **فەرمووی**( هلا شققت قلبه؟) **صحيح مسلم ٦٧/١ .**

**بۆچی خۆ دلێت كەرت كردووە.**[٧٦]( أما الأعمال فهي تتزايد في نفسها) **كردەوەكان لەخۆیاندا زیاد دەكەن** ( والأيمان في نفسه لايزيد ولا ينقص ) **ئیمان لەخۆیدانە زیاد دەكات ونەكەم دەكات.**

.............................................................

**ئایا ئیمان زیادو كەم دەكات؟ دووراهەیە لەم مەسئەلەدا:**

---

(١٢٢) : النحل :١٠٦ .

(١٢٣) : الحجرات ١٤.

(١٢٤) : شرح رمضان افندي على شرح العقائد:٢٥٩ .

**ڕای یەکەم** : ئیمان زیادو کەم دەکات , ئەوە ڕای ئەو زانایانەیە کە کردەوە ڕوکنە لایان بۆ ئیمانی کامل بەڵگەیان هێناوەتەوە بەمانەی لای خوارەوە:

أ -خودا دەفەرموێت ﴿ فأما الذين أمنوا فزادتهم إيماناوهم يستبشرون﴾التوبه:١٢٥ : ئەوانەی ئیمانیان هێناوە ئیمانەکەیان زیاددەبێت وەئەوان مژدە دەدەن .

ب - خودا دەفەرموێت ﴿ وإذا تليت عليهم أياته زادتهم إيمانا﴾ الأنفال٢ واتە: کاتێك کە ئایاتی خودایان بەسەردا دەخوێنرێتەوە ئەوئایەتانە دەبن بەهۆی زیاد بوونی ئیمان .

ج- پێغەمبەر (دروودی خودای لە سەر بێت) دەفەرموێ ( لو وزن إيمان أبي بكر مع إيمان الخلائق لرجح إيمان أبي بكر ) رواه اسحاق ابن راهويه والبيهقي.واتە : ئەگەر بکێشرایە ئیمانی ئەبو بەکر لەگەڵ ئیمانی هەموو خەڵکدا ئیمانی ئەبو بەکر زیادی دەبوو .

**ڕای دووەم** : ئیمان زیادو کەم ناکات - ئەمەڕای ئەو زانایانەیە کە کردەوەیان لەمیانەی ئیماندا نەگەراندووە : وتویانە بێگومان باوەڕی دڵ کاتێك گەیشتە سنووری ( جزم ) دان پیانان وگەردن کەچی زیادو کەم تەسەور ناکرێت تیایدا.

ئەم بەڵگانەیان هێناوەتەوە لەسەری :

١- خـودای گـەورە ئیمـانی بـەکار هێنـاوە بـۆ گوناهبـاران لـەزۆر ئایەتدا , ئەمـە بەڵگەیـە لەسـەر ئەوەی کردەوە هیچ پاشماوەیـەکی نیـە لەئیماندا.

٢- خودا عەطفي کردەوە ( عمل) دەکاتـە سەر ئیمان , عـەطفـیش بەڵگـەی جیاوازییـە وەك خـودا دەفـەرموێت ﴿ إن الـذين أمنـوا وعملـوا الصالحات﴾ الكهف ١٠٧ واتـە : بەراسـتی ئەوانـەی ئیمانیان هێنـاوەو کـردەوەی چاکیان کـردووە . لەسـەر ئەمـە کـردەوەی چـاك لەئیماندانیـە تەئسیری زیادوکەم ناکاتە سەری.

٣- خـودا ئیمـانی گێـراوە بەمـەرج بـۆ وەرگـرتنی کـردەوە وەك دەفەرموێت ﴿ومن يعمل من الصالحات من ذكر او أنثى وهو مؤمن ﴾ النساء ١٢٤ واتە: هەرکەسێك کردەوەباشـەکان بکـات پیاوبێـت یـاژن کـە ئیمان داربێت .

## والأيمان و الإسلام واحد

ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کردەوە جگە ئیمانە ,بەمەرج گیراو ( کـردەوە ) ناروانـە نـاو مەرجـەوە(ئیمـان)وەلآم دراوەتـەوە بـەوەی ئیمـان زیاددەکـات مەبەسـت زیـاد کردنـی بەرەکـەت و پاشمـاوەو رونـاکی دڵـە کەوەسـف کرابێـت پێی . کەزیاد دەبێت بەخواپەرستی و کـەم دەبێت بـەگوناهکردن. دەگونجێـت

وەلاّم بدرێتەوە بەوەی کردەوە زیاد دەبێت لەئیماندا , ئێمە مەبەستمان ئەوەنیە کردەوە پارچەیەکی سەرەکی یە لەئیماندا ,بەلاچوونی کردەوە ئیمان لادەچێت بەڵکو کردەوە پارچەیەکی تەواوکەرە [٧٧] .

( **والأيمان و الإسلام واحد** ) ئیمان و ئیسلام یەکن .

**ئایا ئیسلام و ئیمان یەك شتن ؟ زاناکان جیاوازییان هەیە تیایدا لەسەر دوورا :**

**رای یەکەم** : ئیسلام و ئیمان یەك شتن . ئیسلام سەرکەچی و گەردن کەچی یە بۆ وەرگرتنی حوکمەکان و خۆ بەدەستەوە دانە بۆی , ئیمان جگە لەمە مەبەست نیە . باجیاواز بن لەرووی تێگەیشتنەوە بەلام هەردووکیان یەکن لەرووی ئەوەی راستی دێت بەسەریدا . خودا دەفەرموێت [ فأخرجنا من كان فيها من المؤمنين فما وجدنا فيها غير بيت من المسلمين ] ذاريات : ٣٥ و ٣٦ واتە: ئێمە دەرمان کرد لەو ئاوەدانییە ئەوان تیایدا بوون لەخاوەن باوەڕەکان , بەلام ماڵێك زیاتر موسولمانمان تیا دەست نەکەوت . لەکەس وەرناگیرێت کەموئمین بێت و موسلم نەبێت یا (مسلم) بێت و (مؤمن) نەبێت

**رای دووەم** : دەڵێن : ئیمان و ئیسلام جیاوازن . بەڵگەیان هێناوەتەوە بەم فەرموودەیە : ﴿ قالت الأعراب أمنا قل لم تؤمنوا ولكن

---

(١٢٥) : شرح النسفية في العقيدة النسفية ل : ١٦٧ و ١٦٨ .

قولوأ أسلمنا ولما يدخل الآيمان في قلوبكم ﴾ **الحجرات :١٤ واته: عەرەبە دەشتەكییەكان وتیان : ئێمەئیمانمان هێناوە , تۆ بڵێ بەوانە : ئیمانتان نەهێناوە , بەلام بلێن : بەدیمەن ملمان كەچ كردووە و هێشتا باوەڕ نەرۆیشتووەتە ناو دڵتانەوە ئەم ئایەتە نەفی ئیمان دەكات لێیان و ئیسلام دەچەسپێنێت بۆیان لەسەر ئەمە ئیمان و ئیسلام جیاوازن .**

**وەبەڵگەیان هێناوەتەوە بەحەدیسی جبریل كەپرسیاری لەپێغەمبەركرد لەئیمان فەرمووی :** ( أن تؤمن بالله وملائكته ....الخ ) رواه المسلم [78] .

**وإذا وجد من العبد التصديق والأقرار صح له أن يقول أنا مؤمن حقا ،ولا ينبغي أن يقول أنا مؤمن إن شاء الله تعالى والسعيد قد يشقي والشقي قد يسعد , والتَّغيير يكون على الشقاوة والسعادة دون الأسعاد والأشقاء وهما من صفات الله تعالى ولاتغير على الله تعالى ولا على صفاته**

---

**( وإذا وجد من العبد التصديق والأقرار صح له أن يقول أنا مؤمن حقا )** ئەگەر لە بەندەیەكدا باوەڕو ئیقرار كردن دەست كەوت دروستە

---

(١٢٦) : هەمان سەرچاوەی پێشوو ل : ١٦٩ , ١٧٠ .

بۆی بڵێت من بەراستی باوەڕ دارم ( **ولا ینبغي أن یقول أنا مؤمن إن شاء الله تعالی** ) پێویست ناکات بلێت ئەگەر خودا ئارەزووی بوو ئیماندارم ( **والسعید قد یشقی** ) بەختەوەر کەم جارێك نەگبەتی دەیگرێت پاشگەز دەبێتەوە لەدوای باوەڕهێنان ( **والشقي قد یسعد** ) نەگبەت کەم جارێك بەختەوەر دەبێت بەم شێوە ئیمان بێنێت لەدوای کوفرەوە .

پێغەمبەر (درودی خودای لە سەر بێت) دەفەرموێت ( فوالله الذي لا إله غیره إن أحدكم لیعمل بعمل أهل الجنة حتی مایكون بینه وبینها إلا ذراع فیسبق علیه الكتاب فیعمل بعمل أهل النار فیدخلها وإن احدكم لیعمل بعمل أهل النار حتی ما یكون بینه وبینها إلا ذراع فیسبق علیه الكتاب فیعمل بعمل أهل الجنة فیدخلها ) رواه الأربعة ، واته : سوێند بێت بەوخودایە کە هیچ خودانیە جگە ئەو بەراستی یەکێك لەئێوە کردەوە بەکردەوەی ئەهلی بەهەشت دەکات تا لەنێوان ئەو وبەهەشتدا نامێنێتەوەجگە گەزێك زاڵدەبێت بەسەریدا ئەوەی لەناو سکی دایکیدا بۆی نوسراوە بەکردەوەی ئەهلی دۆزەخ کردەوە دەکات دەرواتە ناوی دۆزەخ وەبەراستی یەکێك لەئێوە کاردەکات بەکردەوەی ئەهلی دۆزەخ تا لەنێوان ئەو و دۆزەخەدا نامێنێتەوە جگە گەزێك زاڵدەبێت بەسەریدا ئەوەی لەناوسکی دایکیدا بۆی نوسراوە کاردەکات بەکردەوەی ئەهلی بەهەشت و دەرواتەناوی بەهەشت.

**( والتغـيير يكـون علـى الـشقاوة والـسعادة دون الأسـعاد والأشـقاء )**

گـۆران دەبێـت لەسـەر نەگبـەتی وبەختـەوەری جگـە بەختـەوەرکردن وبەدبەختکردنە"الاسعاد والآشقاء" چونکە ( **وهما من صفات الله تعـالى** ) ئەو دوانە لەسیفاتی خودان و ئەزەلین .( **ولاتغير على الله تعالى ولا علـى صفاته** ) گۆڕان کاری نایەت بەسەرزاتی خودا و سیفاتی خودا.

# بەشی پێنجەم

## پێغەمبەران و فریشتەکان

ئەمانەی لەخۆ گرتووە:

١- پێناسەی "النبی" و"الرسول"

٢-حیکمەت لەناردنی پێغەمبەراندا

٣-ئایا پێغەمبەر لەغەیری ئادەمیزاد دەبێت ؟ ئایا ئافرەت دەبێت ؟

٤-گرنگی پێغەمبەران

٥-موعجیزە پێغەمبەران وکەراماتی ئەولیا

٦-ژمارەیان و کێ یەکەم وکێ کۆتایی هێنەریانە؟



٧-ئـەوەی واجبـە و ئـەوەی مەحالـە و ئـەوەی دروسـتە لەحەقیاندا .

٨-روونکردنەوەی بەرێزترینیان

٩-بونی فریشتە

١٠- هاتنـە خـوارەوەی کتێبـەکان بـۆ سـەر پێغەمبەران

١١- موعجیزەی شەو رەوی و بەرز بونەوە .

وفي ارسال الرسل حكمة فقد ارسل الله تعالى رسلا من البشر الى البشر

---

( وفي ارسال الرسل حكمة) لەناردنی پێغەمبەراندا پەرژەوەندی و سودو پاشماوەی چاك هەیە . " نبي " ئادەمیزادێکە کە خودا وەحی بۆ کردبێـت بـەهۆی جبریلـە وە بەشـەرعێك وەئـەمری پـێ نـەکرابێت بەگەیانـدنی بەخـەڵکی وە" رسـول " ئادەمیزادێکـە کـە خـودا بـەهۆی حـەزرەتی جبریلـە وەشـەرعێکی بـۆ ناردبێـت وەئـەمری پـێ کرابێـت کـە بیگەیەنێت بەخەڵکی .

پەرژەوەنـدی لـەناردنی پێغەمبەرانـدا تـەبلیغ کردنـی ئـادەمیزادە لـەوەی کـەژیری نـەتوانێت سـەبەخۆ بیزانێـت , وەتـا بەڵگـەش نـەبێت بەسەر خوداوە کاتێك ویستی لـەڕۆژی قیامەتدا بەندەیەکی موحاسـەبە بکات , چونکە ڕوولیّ نان نیە لەسەر ئادەمیزاد لەشتێکدا کە نەیزانێت وە بەرپرسیاریش نیە لێی .وەك خودا دەفەموێت : ﴿ وما كنا معذبين حتى نبعث رسولا﴾ الاسراء :١٥ .واتە قەت کەسمان سزا نەداوەوکەس سزا نادەین لەسەر کردەوە وبیر وباوەڕی هەتا پێغەمبەر دەنێرین وباسی چاکە و خراپەیان بۆ دەکات .

وەهـەروەها دەفـەرموێت : ﴿ رسـلا مبشرين ومنـذرين لـئلا يكـون للناس على الله حجة بعد الرسول وكان الله عزيزأ حكيم﴾ النساء . ١٦٥:
واتــە: ئـەو پێغەمبەرانــە مـژدەدەر وترسـێنەر بـوون ,لەبەرئـەوەی بـۆ ئادەمیزاد بەڵگەی لەسەر خودا نەبێت لەدوای پێغەمبـەران .( **فقـد ارسـل الله تعالىرسـلا مـن البـشر الى البـشر** ) بێگومـان خـودای تـەعالا پێغەمبـەرانی نـاردووە لـەئادەمیزاد بـۆ ئـادەمیزاد واتـە :پێغەمبـەران لـە ئادەمیزادن و لەپەری و فریشتە نین .

ئایـا پێغەمبـەر لەغـەیری ئـادەمیزاد دەبێـت ؟ ئایـا لەغـەیری پیـاو دەبێـت ؟ ناگونجێـت پێغەمبـەر ئـادەمیزاد نـەبێت , چـونکە ئەگـەر لەفریـشتە بێت یا لەپـەری بێـت نـەدەگونجا ئادەمیزاد ببیینێـت و پێـی بگـات مەگـەر فریشتەکە یاخود پەرییە کە بڕۆیـشتایەتە سـەر شـێوەی ئادەمیزاد, توانانیە بۆ ئادەمیزاد لەسـەر بینـینی پـەری وفریـشتە مەگـەر لەسەر ڕیگای شکاندنی عادەت نەبێت و لەگـەل ئەوەدا دەگونجێت . بۆ فریشتەو پەری ئادەمیزاد ببینن .

## مبشرين ومنذرين ومبينين للناس ما يحتـاجون اليـه مـن أمـور الـدنيا والدين وايدهم بـالمعجزات الناقضات للعادة وأول الأنبـاء آدم وأخـرهم محمد عليهما الصلاة والسلام

وەپێغەمبەران دەبێت پیاو بێت وەك خودا دەفەرموێت ﴿ وما أرسلناك قبلك إلا رجالانوحي إليهم﴾ النحل :٤٣ واتە ئێمە لەپێش تۆدا بەریسالەت كەسمان نەناردوە مەگەر چەند پیاوێكی خوو رەوشت بەرز .( **مبشرين ومنذرين** ) پێغەمبەران مژدەدەر وترسێنەرن ( **ومبينين للناس ما يحتاجون الية من أمور الدنيا والدين** ) بۆخەڵكی

روون كەرەوەن لەوشتانەی كەپێویستیان ببێت پێی لەكاری دونیاودیندا. وەك خودا دەفەرموێت :﴿ مبشرين ومنذرين ﴾

كاری دونیایی دەگەڕێتەوە بۆ عورف و عادەت پەیامی پێغەمبەران پەیوەندی نیە پێیەوە , جارێك پێغەمبەر (د.خ) رۆیشت بەلای پیاوێكدا كە خورمای پێوەندی دەكرد فەرمووی وازی لێ بێنن ئەوانیش وازیان لێ هێنا لەپاشا لا وازو بێ كەڵك دەرچوو پێغەمبەر (د.خ) زانی خراپ دەرچووە فەرمووی ( انتم اعرف بأمور دنياكم) ئێوە خۆتان چاكتر شارەزان بەكاری دونیاتان . ( **وايدهم بالمعجزات الناقضات للعادة** ) خودا كۆمەكی كردوون بەموعجیزە كەعادەت هەڵدوە شێنێتەوە.

موعجیزە بەڵگەیە لە سەر راستی پەیامی پێغەمبەر , پێغەمبەر رەوانەكراوە لەلایەن خوداوە ئێمە ناتوانین باوەڕ بە ئادەمیزادێك بكەین كە ئیدعای پێغەمبەرایەتی بكات مەگەر كاتێك نەبێت لە سەر دەستی شتێك روو بدات كە بەڵگە بێت لە سەر راستی پێغەمبەرایەتییەكەی و

مەرجیش ئەوەیە نابێت ئەو شتە ئەو دەیکات بەئاسانی پەیدا ببێت , ئەو شتەی پەیدانابێت بەئاسانی پێی دەوترێت موعجیزە. موعجیزە : کارێکە لەعادەت دەرچووبێت ئاشکرا دەبێت لەسەر دەستی ئەو کەسەی کەئیدعای پێغەمبەرایەتی دەکات.

( وأول الأنبياء أدم وأخرهم محمد عليهما الصلاة والسلام ) یەکەم لەپێغەمبەراندا ئادەمە و کۆتایی هێنەریشیان موحەممەدە سەلات و سەلام لەسەرهەدووکیان بێت .

ئەوە گومانی تیادانیە یەکەم پێغەمبەر لەسەر رووی زەوی ئادەمە کەباوکی بەشەرە وقورئان بەڵگەیە لەسەر ئەوەی فەرمانی پێ کراوە بەعیبادەت وچاکە وقەدەغەیشی لێ کراوە لەشتی حەرام , وەپێغەمبەر یش لەزەمانی ئەو دانەبووە ،ئەمەش بەوەحی دەبێت .

## وقد ورد بيان عددهم في بعض الأحاديث

---

وە پێغەمبەرایەتی موحەممەد (درودی خودای لە سەر بێت ) ئەوەیە ئیدیعای پێغەمبەرایەتی کردووەو موعجیزەیشی ئاشکرا کردووە ,ئیدیعای پێغەمبەرایەتیەکەی زانراوە بەتەواتور و وەئاشکرا کردنی موعجیزەی لەدوو رووە بووە : یەکەم : ئاشکرای کردووە کەقورئان کەلامی خودایە, تەحەددای کردووە تە سەر عەرەبەکان کەزۆر رەوان بێژبوون بەوەی کەسورەتێك بێنن وەك قورئان ئەگەر قورئان کەلامی خودانیە .

دووەم : وەرگیراوە لەپێغەمبەر کەچەندەها موعجیزە ئاشکرا بووە لەسەر دەستی داخودا لەقورئاندا دەفەرموێت :﴿ ماكان محمد أبا أحد من رجالكم ولكن رسول الله وخاتم النبيين وكان الله بكل شيئ عليما ﴾

الاحزاب:٤٠ واتە : موحەممەد باوكی كەسێك لەپیاوەكانتان نەبووە و بەلام دواپێغەمبەری خودایەو ,خودازانایە بەهەموو شتێك .

وەپێغەمبەری خوا (درودی خودای لە سەر بێت) دەفەرموێت :(وێنەی من ووێنەی پێغەمبەرانی پێش خۆم وەك وێنەی پیاوێك وایە خانویەكی بەجوانی ورێك وپێك دروست كردبێت جگە جێگای خشتێك نەبێت لەسوچێكەوە وەخەڵكی تەوافیان دەكردوو سەریان سور دەمالێی ودەیان وت ئەوە بۆچی ئەو خشتەیەدانانرێت ؟ من ئەو خشتەم و من كۆتایی هێنەری پێغەمبەرانم ) متفق علیه.

( وقد ورد بیان عددهم في بعض الآحادیث ) بەراستی باسكردنی ژمارەی پێغەمبەران لەهەندێك حەدیسدا هاتووە. گێراویانەتەوە كەلەپێغەمبەر (درودی خودای لە سەر بێت) پرسیار كرا لەژمارەی پێغەمبەران فەرمووی :هەزارو سەد وبیست وچوار پێغەمبەر ە رواه ابن حبان كە( ٣١٣ ) میان " رسول "ە ، وە لەریوایەتێكی تردا دووسەدو بیست وچوار هەزار پێغەمبەرە .

سیفەتی پێویست و نەشیاوو رەوای پێغەمبەران (د.خ) :

ئەوسیفەتانەی كەپێویستە لەپێغەمبەراندا ببن سێ سیفەتن :١- راستگۆیی ٢- ئەمانەت ودەست پاكی ٣- گەیاندنی ئایین بەخەڵك .

بەڵگەی بێگومان لەسەر پێویستیەتی راستگۆیی پێغەمبەران ئەوەیە : كەدرۆ لەپێغەمبەرانەوە دەبێتە هۆی درۆ لە وتاری خوادا , چونكە خودای گەورە موعجیزەی

.........................................................

داوە بەپێغەمبــەران , راســتگۆیی ئــەوانی لەبــەردەم هــەموو خەڵكــدا چەسـپاندووە, ئەمـەش واتـە: پێغەمبـەران هەرچـی دەڵـێن راسـتەو درۆیـان لێناوەشـێتەوە, بێگومـان ئەگـەر خوانەخواسـتە درۆیـان لێدەركـەوێ دەچێت بەگژی تەصـدیقەكەی خـوداو ئـەوەی لـێ ی دەبێتەوەلەوانەیەراسـت بكـەن و لەوانەیە راست نەكەن هەروەها دەكێشێتەوە بۆ ئەوەی كەلامی خودای گەورە راست بێت و راست نەبێت ئەمەش مەحالە .. ..

بەڵگە لەسەر ئەمانەت و دەستپاكی پێغەمبەران وگەیاندنی ئەحكام بەخەڵك ئەوەیە ئەگەر ئەم زاتە پاكانە ئەمین نەبن و كردەوەیان حـەرام یـان مـەكروە بێـت دەبێتـە هـۆی كـۆ بوونـەوەی دوودژ( جمـع النقیـضین) ,چـونكە لەلایەكـەوە ئیتاعـەو بـەگوێ كردنیـان لەهـەموو كردەوەیەكـدا واجبـە لەبەر ئەوەی كەخودا فـەرمانی داوە بەئیتاعـەكردنیان و هەرچـی ئـەوان كردوویانـە پێویـستە ئێمـەش جـێ بـەجێ ی بكـەین و لەلایـەكی تریــــشەوە پێویــــستە لەســــەرمان لــــەكردەوەی حــــەرام و نــــارەوا دووربكەوینەوە نەش هێڵین خەڵك بیكات, لەم حالەدا ئێمەپێویستە ئەو كردەوە حەرامە بكەین كە ئەوان كردوویانە , چونكە ئیتاعەیان واجبەو پێویستە نەیكەین چونكە حەرامە ! !

هـەروەها ئەگـەر فـەرمانی خـودا نەگەیـەنین و غـەیری فـەرمانی ئـەو بگەیەنین , ئێمە لەلایەكەوە دەبێت دوایان كەوین چونكە دواكەوتنیان واجبەو لەلایەك دەبێت دوایان نەكەوین چونكە فەرمانەكە هی خودا نیـە !!

ئەو سیفەتانەش كەرەوا( جائز)ن بۆ پێغەمبەران (دروودی خودای لە سەر بێت) بریتین لەوانـەی روودەكەنـە ئـادەمیزاد ، وەكـو سـاغی ونەخۆشـی و نوسـتن و لەخـەو هەستان وحەز لەهەنـدێ خواردەمـەنی كـردن و حـەز نـەكردن لەهەنـدێكی تـر .

بەلێ هەررووداوێك کەلەگەل پایەو پلەی ئەواندا رێك نەکەوێت: وەك کوێری و کەری لەکاتی رەوانەکردنیاندا ,یان وەك گولی و بەلەکی و قۆری و باقی ئەحوالی ناشین , وەهەرگیز بۆ پێغەمبەران رەوانیە لەکاتی بەپێغەمبەر بوونیان و بۆسەر خەڵك رەوانە کردنیان ,بەلام ئەگەر لەپاش دامەزراندنی پێغەمبەریەتیەکە بوو ئەوە قەی ناکات .

بۆ نموونە : بێ هێزی چاوی حەزرەتی یەعقوب و ناساغی و برینی لەشی حەزرەتی ئەیووب لەپاش دامەزراندنی پایەی پێغەمبەریی ئەوان بووە و , مایەی پایە بەرزیان بووەو پەندو ئامۆژگاریەکی ئایینی بەتین بووە بۆ ئادەمیزادەکانی تر [٧٩] .

**والأولى أن لايقتصر على العدد في التسمية فقد قال تعالى( وَ منهم من قصصنا ومنهم من لم نقصص عليك ) ولا يؤمن في ذكر العدد أن يدخل فيهم من ليس منهم أو يخرج منهم من هو فيه وكلهم كانوا مخبرين مبلغين عن لله تعالى, صادقين ناصحين ,وأفضل الانبياء محمد** ( صلى الله عليه و سلم ) **والملائكة عباد الله تعالى عاملون بأمره لا يوصفون بذكورة ولا أنوثة**

---

( **والآولى أن لايقتصر على العدد في التسمية** ) چاکتر وایە کورت هەلنەهێنرێت لەناوبردندا لەسەر ژمارە ( **فقد قال تعالى: منهم من قصصنا ومنهم من لم نقصص عليك** ) هەندێك لەو پێغەمبەرانە باسمان کردووە وەهەندێکیان باسمان نەکردوەبۆت .

---

(١٢٧) : مەکتوباتی کاك ئەحمەدی شیخ ١/٧٤ و٧٥و ٧٦ .

( **ولا يؤمن في ذكر العدد أن يدخل فيهم من ليس منهم** ) نابێت بێ ترس بێت لەباس کردنی ژمارەی پێغەمبەراندا چونکە دەرواتەناویان کەسێك لەوان نیە ئەگەر ژمارەیەکی زۆر بلێت لەژماردنیاندا ( **أو يخرج منهم من هو فيه** ) یاخود دەری بکەیت لەپێغەمبەران کەسێك کەلە پێغمبەرانە , ئەگەر ژمارەیەکی کەم بڵێیت لەژماردنیاندا ( **وكلهم كانوا مخبرين مبلغين عن الله تعالى** ) هەموو پێغەمبەران هەواڵ دەرو گەیەنەر بوون لەلایەن زاتی خوداوە( **صادقين ناصحين** ) راست و ئامۆژگاری کاربوون .

( **وأفضل الانبياء محمد** (صلى الله عليه و سلم) ) بەرێزترین و گەورەترین پێغەمبەران حەزرەتی موحەممەدە (درودی خودای لە سەر بێت) لەبەر فەرمودەی خودا : ﴿ كنتم خير أمة أخرجت للناس﴾ النساء :١١٠ , واتە ئێوە ئەی ئوممەتی موحەممەد (درودی خودای لە سەر بێت) چاکترین ئوممەتێکن کەلەلایەنی پەروەردگارەوە دروست کراون و دەرکراون بۆ پەیرەوی پێغەمبەران ئەگەر ئەم ئوممەتە چاکترین ئوممەت بێت پێغەمبەرەکەشی چاکترین پێغەمبەرە , ئەگەر بەرێزترین نەبێت ئوممەتەکەی بەرێزتر نەدەبوو , هاتووە لەفەرموودەی پێغەمبەر (درودی خودای لە سەر بێت) : ( أنا سيد أولاد آدم ولا فخر ) .رواه الترمذي واتە: من سید و گەورەی نەتەوەی ئادەمم وەفەخریش نیە .

لەپاشا دانەر هات باسی یەکێکی ترلەئەرکەکانی ئیمان دەکات ئەویش باوەڕ بەفریشتەیە و فەرمووی ( **والملائكة عباد الله تعالى عاملون بأمره** ) فریشتەکان بەندەی خودان بەفەرمانی خودا کار دەکەن ( **لايوصفون بذكورة ولا أنوثة** ) وەصف دارناکرێن بەنێرو مێ.

## ولله تعالى كتب أنزلها على أنبيائه وبين فيها أمره ونهيه ووعده والمعراج لرسول الله (صلى الله عليه و سلم) في اليقظة بشخصه الى السماء ثم الى ماشاء الله من العلى حق

فريشته : بريتين لەئەجسامێكی لـەطیف خودا دروستی كردوون لەئەصلی نورو ماددەی روناك نەنێرو نەمێ دەتوانن بەهەموو وێنەیەك خۆیان دەربخەن و بەسورەتی عادەتی بەچاو نابینرێن بەلام پێغەمبەران دەیان بینن [٨٠]

( **ولله تعالى كتب أنزلناها على أنبيائه** ) چەند پەرتوكێك هەیە بۆ خودا كە رەوانەی كردۆتە سەر پێغەمبەرانی ( **وبين فيها أمره ونهيه ووعده ووعيده** ) كەتیایدا روونی كردووەتەوە فەرمان و قەدەغەو بەلێن و هەرەشەكانی . پێویستە باوەرمان ببێت بەكتێبەكانی خودا كەروكنێكە لەئەركانی ئیمان ئەویش ئەوەیە باوەڕ بەوەی كە خودا چوار كتێبی رەوان كردووە كە فەرمان و قەدەغەو بەلێن و هەرەشەو هەوالی سەردەمی رابردوو و لەمەودوایشی تێدایە , هەموو كەلامی خودان ، بەرێزترینیان قورئانە لەپاشا تەوراتە و ئینجیل و زەبوور هەروەها سەد سوحوف رەوانە كردووە .

( **والمعراج لرسول الله** (صلى الله عليه و سلم) **في اليقظة بشخصه إلى السماء** ) بەرزبونەوە بۆ پێغەمبەر (درودی خوای لە سەر بێت) لەكاتی بەئاگاییدا بەلاشەی پیرۆزی بۆ ئاسمان ( **ثم الى ما شاء الله من العلى حق** ) لەپاشا بۆ ئەو

---

(١٢٨) : شەریعەتی ئیسلام : ١١/١ .

شـوێنه بـه ڕزەی کـەخودا ئـارەزووی بـوو حـەق و ڕاسـتـه . میعـراج لـەزاراوەی زانایـانی ئیـسلامدا بەرزبوونـەوەی پێغەمبـەرە بەدەپایـە لەبەیتی موقەددەسەوە تا ژووری حەوت ئاسمانەکان و لەو پێشەوە تا ( سـدرة المنتهـی ) و , لەوێیـشەوە تـا عـەرش و ئـەو شـوێنەی کـە پێغەمبەر (درودی خوای لە سەر بێت) کەلامی زاتی خودای تیادا وەرگرت و پێنج فـەرزەی نوێـژ لەسـەرخۆی و ئوممەتەکـەی فـەرز کـرا . ئـەم میعراجـە بەحەدیـسی صـەحیحی بوخـاری چەسـپاوە و ئینکـار کردنـی بیدعەتـەو دەرچوونە لەریزی ئەهلی سوننەت و جەماعەت [٨١].

## وَكرامات الأولياء حقٌ

---

سەیید عەبدوڕەحیم مەولەوی بەچەند دێرێك لەهۆنراوەکانی باسی ئەوە دەکات کە ئەو هەموو شتە زۆرانە لەماوەکی زۆر کەمدا ڕوویداوە , وەك دەفەرموێت :

ڕێی چەند هەزار ساڵ , طه ی چەند حیجابات
ذاتـي حەق , کەلام , سؤال , جەوابات
چوو, بوو دیی , بیستی , کریا , دریاوە
هاتـەوەو حـەڵقـە هـەر دەلـەریاوە

[٨٢].

---

(١٢٩) : عەقیدە مرضیة ل : ٤١٠ و ٤١١ .

(١٣٠) : لەهەمان سەرچاوە.٤٢٢.

**( وكرامات الأولياء حق ) كەراماتی ئەولیا دۆستانی خودا حەق و راستن . خودا لە قورئاندا باسی ئەولیا دەكات و دەفەرموێت :**﴿الا ان اولياء الله لا خوف عليهم ولا هم يحزنون الذين آمنوا وكانوا يتقون لهم البشرى فى الحياة الدنيا وفى الاخرة لاتبديل لكلمات الله ذلك هو الفوز العظيم ﴾يونس:٦٤.

**واتە :ئاگادار بن ئەوانە كە دۆستی خودان نەترس و بیمیان لە هیچ شتێك دێبە سەراو نەلەسەر نەمانی شتێك زۆر دەبن ئەوانەن كە ئیمانیان هەیە بە خوداو پێغەمبەری خوداو لەخودا دەترسن وخۆیان دەپارێزن لەكوفرو تاوان لە كاری پەستی جیهان , بۆ ئەوانە هەیە موژدە لەماوەی ژیانی دونیادا وەلە رۆژی قیامەتیشدا فریشتەی رەحمەت دێن خەبەریان پیٚ دەدەن كەئێوە ئیتر ئازار نابینن , گۆرین نیە بۆ فەرمودەی خودا وەگەیشتن بەپایەی موژدە وەرگرتن گەیشتنەبە مەقامێكی گەورە لەلای خودا .**

**پێغەمبەر** (درودی خوای لە سەر بێت) **دەفەرموێت:خودا دەفەرموێت:**﴿من عادى لى ولياً فقد آذنته بالحرب ...﴾رواه البخارى. **واتە هەر كەس دژایەتی بكات لەگەل دۆستی مندا بەراستی ئاگاداری دۆستەكەم دەكەم كە ئەو كەسە شەر لەگەل مندا دەكات .**

**فيظهر الكرامة على طريق نقض العادة للولي من قطع المسافة البعيدة في المدة القليلة ,**

شێخی ئیبن و حەجەر دەفەرموێت : ئەزیەتدانی ئەولیاو مامەڵەی سوئی خاتیمەیە پەنا بە خودا .مەولەوی پێناسەی وەلیمان بۆ دەکات و دەفەرموێت :

وەلـــــی :شەخصیکە ( عاریفٌ باللە )

( ما أمکَنَ ) بـە ذات ب ەصیــفات

ئاگاه

بـیکێـشی بەسـەنگ هەرسێ تـەقوادا

بــە تـــەرازووی شـەرع مـوویــێ

لانـادت [83]

کـارە لەعادەت بەدەرەکان چوارن :-

١- **موعجیزە** : کارێکە لـە عـادەت دەرچوو بێت ئاشکرا دەبێت لـە سەر دەستی ئەو کەسەی کە ئیدیعای پێغەمبەرایەتی دەکات .

٢- **کەرامەت** : ئاشکرا بوونی کارێکی دەرچووە لە عادەت لـە لایەن دۆستێك لە دۆستانی خودا بە بێ ئەوەی بەرابەر کێ بکات بەبانگەوازی پێغەمبەرایەتی .

٣-**إســتدراج** : کـارێکی لـەعادەت بـەدەرە ئاشـکرا دەبێـت لەسـەر دەستی کەسێك کەباوەڕی نیەو کردەوەی چاك ناکات .

---

(١٣١) : سێ تەقوا : خۆپاراستن لە کوفر . گوناە , خۆشەویستی لە غەیری خودا .

٤- مەعونــە : كــارێكی لــەعادەت بــەدەرە ئاشــكرا دەبێــت لەســەر دەستی موسولمانان بەگشتی .(**فيظهر الكرامة على طريـق نقـض العـادة للولي** ) كەرامەت ئاشكرا دەبێت بۆ وەلی لەسـەر ڕێگـای لـەعادەت بـەدەر ( **من قطع المسافة البعيدة في المدة القليلـة** ) لـەبرینی ئەندازەیـەكی دوور لەماوەیــەكی كەمــدا وەك ئاصــەف كــوری بــەرخیا كــەوەزیری حــەزرەتی سولەیمان بــوو عەرشــی بەلقیسی هێنـا لەیەمـەن بـۆ بـەیت ولموقـەدەس پێش چاو تروكاندنێك , لەگەل ئەوەی مەسافەكەی دوور بوو .

**وظهور الطعام والشراب وللباس عند الحاجة , والمشي علـى المـاء وفي الهواء وكلام الجماد والعجماء**

---

( **وظهور الطعام والشراب واللباس عنـد الحاجـة** ) وە ئاشـكراكردنی خواردن و خواردنەوە و پۆشاك لە كاتی پێویستیدا .

وەخودا دەفەرموێت لەبارەی مەریەمدا : ﴿كلما دخل عليها زكريا المحراب وجد عندها رزقا قال يا مريم أنى لك هذا قالت هو من عندالله إن الله يرزق من يشاء بغير حساب﴾ ال عمران : ٣٧ .

واتــە : هەمیــشە هــەركاتێك كەزەكــەریا دەرۆیــشتە ئــەو میحرابــەو تەماشــای دەكــرد رزق و رۆزی چــاوپێدەكەوت , ئــەی فــەرموو : ئــەی مەریــەم چــۆن و لــەكوێوە ئــەم رزق و رۆزیــەت بــۆ دێ ؟ ئــەویش عــەرزی دەكــرد : ئەمانــە لــەلای خــوداوە , بەراســتی خــودا رۆزی دەدات بەهــەر كەسێك خواستی لێ ببێت .

( **والمــشيّ في المــاء** ) لــەئاودا رۆیــشتن .وەك ریوایــەت كــراوە لــەزۆر ئــەولیاوە . ( **وفي الهــواء** ) لەهــەوادا رۆیــشتن . وەك ریوایــەت كــراوە

جەعفەری كوری ئەبی تالیب و لوقمانی سەرخەسی و جگە ئەمانەیش كە بەهەوادا رۆیشتوون .

( **وكـــلام الجمـــاد** ) قـسەكردنی بـێ گیـان وەك دارو بـەرد . وەك دەگێرنـەوە لەبەردەسـتی حـەزرەتی سـەلمان و ئـەبی دەرداء , قـسعەیە تەسبیحاتی خودای دەكرد , هەردووكیان گوێیان لێبوو.

( **والعجمــاء**) قسەكردنی گیانـدارانی بـێ زمـان , وەك ئـەو سـەگەی ئەصحاب لكەهف بەلایدا رۆیـشتن ئەویش شوێنیان كەوت چەند جار دەریان كرد سـەگەكە وازی نـەهێنا ووتـی پێیـان : ( أنـا أحـب أحبـاب ألله عز وجل فنـاموا وأنـا أحرسكم ) تفسير الـصاوي علـى الجلالين ٣/ ٢٠ واتە : من دۆستانی خـودام خـۆش دەوێـت ئێـوە بخـەون مـن حـەرسیتان دەگرم .

دەگێرنـــەوە پێغەمبـــەر (درودی خـودای لـە سـەر بێـت ) ئامـــادەبوو پیاوێـــك مانگایـــەكی بـــاركردبوو دابوویـــە بـــەر مانگاكـــە لای كـــردەوە بـــەلای پیاوەكەداو ووتی:( إني لم أخلق لهذا وإنما خلقت للحرث) بێ گومان من بۆ ئەمە دروست نەكراوم , بەڵكو بۆ جووت كردن دروست

**أوغير ذلك من الآشياء ، ويكون ذلك معجزة للرسول الـذي ظهـرت هـذه الكرامة لواحد من أمته لأنه يظهر بها أنه ولي .**

---

کراوم .خەڵکەکە ووتیان: پاك و بێگەردی بۆ خودا مانگا قسەدەکات , پێغەمبەر (درودی خودای لە سەر بێت ) فەمووی : ( آمنت بهذا ) . باوەڕم هەیە بەوەی کەمانگا قسەدەکات [٨٤] .

( أوغير ذلك من الآشياء ) یا جگە لەمانە شتی تریش وەك ئەوەی حەزرەتی عومەر رۆژی هەینی ووتاری دەخوێندەوە لەسەر مینبەر لەشاری مەدینە سوپای ئیسلامی دی گەمارۆ دراوە بانگی لەساریە ی سەر لەشکر کردوو فەمووی :( یاسارية الجبل ) ساریە ئاگاداری ئەو شاخە بە ساریەش گوێی لەدەنگی حەزرەتی عومەر بوو لەگەل ئەوەش زۆر دوور بوون لەیەکەوە.

وە خواردنی زەهر لەلایەن خالیدی کوری وەلیدەوە , دەگێرنەوە رۆمەکان داوایان لەخالیدی کوری وەلید کرد پەرداخێك زەهر بخوات بۆ ئەوەی بەڵگەبێت لەسەر راستی ئاینی ئیسلام پەرداخێك زەهریان بۆ هێناو ئەویش بسم الله الذي لا يضر....خوێند و خواردی زیانی پێنەگەیشت[٨٥] .

**مەولەوی دەفەموێت:**

**لە( مەدینە ) وەو جێ لەسەر ( مینبەر ) جەیش لە ( نەهاوەند ) روئیەت بۆ ( عومەر)**

**سەمعی ( ساریە ) بۆ خیتابی ئەو جەرەیانی ( نیل ) بە کیتابی ئەو**

---

(١٣٢) :شرح العقائد :٢٧٧ .

(١٣٣) : شرح النسفية : ٢٠٠.

وەك شوربی ( خالید ) سەم وەبێ ضەرەر    ئەمثـــالی ئەمە نایـەتــە دەفتــەر[86]

( **ویكون ذلك** ) ئاشكراكردنی كەرامات لەلایەن ولی یەوە دەبێت ( **معجزة للرسول الذي ظهرت هذه الكرامة لواحد من أمتـه** ) بەموعجیزە بۆ ئەو پێغەمبەرەیە كە ئاشكرابووە ئەو كەرامەتە بۆ یەكێك لەئوممەتەكەی ( **لأنه يظهر بها أنه ولي** ) چونكە بەهۆی ئاشكرا بوونی ئەو كەرامەتە دەزانرێت ئەوە ولیە .

**ولـن يكـون وليـا إلا أن يكـون محقـأ في ديانتـه وديانتـه ألأقـرار والتصديق برسالة رسوله**

---

( **ولن يكون وليـا إلا وأن يكـون محقـا في ديانتـه** ) وە نابێت بەوەلی مەگەر كاتێك بەرێك و پێكی ئایینەكەی ببا بەرێوە ( **وديانتـه** ) ئاین داریەكەی ( **الأقـرار** ) باوەڕ كردنە بەزمان( **والتـصديق** ) بەدل گەردن كەچیە ( **برسـالة رسـوله** ) بەنامەی پێغەمبەرەكەی لەگەل گوێرایەلی كردنی ئەمرەكانی نەكردنی قەدەغەكانی .

مەولەوییش دەفەموێت :– [87]

كـرامات تبـدو لـذا الـولي    مــعجـيـزةً لـحضـرة الـنبـــي

---

(١٣٤) : عقيده ي مرضية : ٤٣٠ .

(١٣٥) : فضيلة.

ولـم يكـن ولـيـنـا ولـيـا  من غـير أن يـتـابـع الـنبـيـا

وأن يصون النفس عن خيانة  ذا صـفـوة وقـوة الـديـانـة

واتـه: كەرامەتێك ئاشكرا دەبێت لەسەر دەستی دۆستێكی خودا ئەوە موعجیزەیە بۆ حەزرەتی موحەممەد دوستی ئێمە وەلی نیە بەبێ ئەوەی شوێنی پێغەمبەر بكەوێت لەووتارو كردارو ئەحوالدا وەپاش ئەوەی كە نەفسی بپارێزێت لە هەموو خیانەتێك لەگەل خوداو پێغەمبەرو موسولمانانـدا دەبێ حالی وابێت خاوەنی بێ گەردی بێت لە دلەوەوە بەپاك كردنی لەهەموو شتێك بەپێچەوانەی شەریعەتی ئیسلام بێت وەخاوەنی دینێكی بەهێزبێت .[88]

ئاگاداریەك : لەكەراماتەئاگادار بوونی هەندێك لە پیاوچاك بەسەر هەندێ نهێنی و پەنامەكیەكاندا ، لەوانەیە ئەوەی ئینكاری دەكات بەم فەموودەی خودابكات بەبەلگە :  ﴿ وعنده مفاتيح الغيب لايعلمها إلاهو ﴾ أنعام :٥٩ واتە: كلیلەكانی ئەو شتانە كە غەیب و پەنهانن لە عیلم و زانستی خودایە ، وە ﴿ عالم الغيب فلا يظهر على غيبه أحدا﴾ الجن :٢٦ واتە: ئەو زانای پەنامەكیە كەس لەم پەنامەكیە تایبەتیانە ئاگادار ناكات ,

## وأفضل البشر بعد نبينا : أبوبكر الصديق

---

(١٣٦) الوسيلةفي شرح الفضيلة ل: ٧٤٨ و ٧٤٩ .

**وەڵام دەدرێتەوە لەدوو رووەوە :-**

**یەکـــەم** : پـیتی ئـەلف ولام لـەو وشـەی (الغیـب ) بـۆ ئیـستیغراق وسـەلبە واتـە: هەمووغـەیب کـەس نایزانێت جگـە خـودا , وەردەگیرێت هەندێك لەغەیب دەگونجێت جگە خودا بیزانێت , لەپاشا ئایەتی .

**دووەم** : ئیستثنای تیادایە دەفەرموێت :﴿ إلامن ارتضى من رسول ﴾ واتـە : کەسـێك نـەبێت کـە خـۆی بیـەوێت وەکـو پێغەمبـەرێك لەپێغەمبەران ئەمە بەڵگەیە لەسـەر دروسـتی ئاگادار کردنی زاتـی خـودا بۆ هەندێك لەبەندەی لەسەر ئەو شتانەی کە پەنهانە لەحەواسەکان [89] .

( **و افضل البشر بعد نبیّنـا** ) بـەرێزترین و گـەورەترین کـەس لـەدوای پێغەمبەری خۆمان , چاکتر وابوو بیفەمووایە ( **بعد الانبیـاء** ) لـەدووای پێغەمبــەران ( **أبـــو بكـــر الـــصديق** ) ئـەبو بـەکری صـدیقە کـەبروای بەپێغەمبەر (درودی خودای لە سەر بێت ) هێنا بەبێ وەستان وەلەبەرز بوونەوەی بۆ ئاسمانەکان بەبێ گومان.

نـاوی : عەبـدوڵا یـە کونیەکـەی ئـەبو بـەکرەو نازنـاوی (صـدیق) ە باوکی ناوی عوثمانە کونیەکەی ئەبو قوحافەیە . کۆچـی دوایـی کـردووە لەشـەوی سـێ شـەممە ٢٢ ی جمیـادی ئـاخیرەی سـاڵی ١٣ ی کۆچـی بەخاك سپێررا لەتەنیشت پێغەمبـەردا(درودی خودای لە سەر بێت ) . یەکـەم پیـاو بووە موسوڵمان بووە .

مــاوەی خەلافـەتی دووسـاڵ و سـێ مـانگ و بیـست رۆژبـووە . بەڵگەلەسـەر رێزو گـەورەیی خـودا لەقورئانـدا ثـەنای دەکـات و بـەدووەم

---

(١٣٧) شرح النسفية : ل ٢٠٠ .

ناوی دەبات لەخزمەت پێغەمبەرداو دەفەرموێت :﴿ إلا تنصروه فقد نصره الله إذ اخرجه الذين كفروا ثاني اثنين إذ هما في الغار إذ يقول لصاحبه لاتحزن إن الله معنا ﴾التوبة : ٤١ واتە: ئەگەر ئێوە یارمەتی حەزرەتی موحەمەد (درودی خودای لە سەر بێت) نەدەن , بەراستی خودا یارمەتی دەدات,وەك چۆن لەو كاتەدا دەریان كرد یەكێك بوو لەدووكەس كە لەناو ئەشكەوتەكەدابوون فەرمووی دڵگران مەبە خودا والەگەڵمان .

**ثم عمر الفاروق , ثم عثمان ذوالنورين , ثم على المرتضي رضي الله عنهم**

---

پێغەمبەر(درودی خودای لە سەر بێت) دەفەرموێت :( أنت صاحبي في الغار وأنت معي على الحوض ) رواه الترمذي واتە لەغاردا تۆ هاوەلی منی تۆ لەگەڵ منی لەسەر حەوزی كەوسەر

( **ثم عمر الفاروق** ) لەپاشا حەزرتی عومەرە , نازناوەكەی فاروقە , كونیەكەی ئەبوو حەفصەیە ناوی باوكی خەتابە , كۆچی دوایی كردووە لەرۆژی چوارشەممە ٢٥ ی ذیل حەجە ساڵی ٢٣ ی كۆچی تەمەنی شەست و سێ ساڵ بوو .

ئەبوو لوئلوئی مەجوسی شەهیدی كرد , بەخاك سپێرراوە لەتەنیشت پێغەمبەرو ئەبو بەكردا . لەساڵی شەشەمی كۆچی دا ئیسلام بووە , ماوەی خەلافەتی دەساڵ وشەش مانگ و چوار رۆژە . پێغەمبەر (درودی خودای لە سەر بێت) . لەبارەی گەورەیی عومەرەوە دەفەرموێت :﴿ لو كان بعدي نبيا لكان عمر ﴾ مسند الأمام أحمد . واتە: ئەگەر پێغەمبەر ببوایەدوای من عومەر دەبوو .

( **ثم عثمان ذو النورين** ) لەپاشا حەزرەتی عوثمانە , نازناوەکەی ( ذي النورين) ە , لەبەر ئەوەی دووکچی پێغەمبەری (درودی خودای لە سەر بێت ) هێناوە , یاخود لەبەر ئەوەی رۆژێ دووجار خەتمی قورئانی کردووە . لەرۆژی هەینی لەجەژنی قوربان کۆچی دوایی کرد کە ساڵی ٣٥ ی کۆچی بوو , بەخاك سپێررا لەبەقیع , ماوەی خەلافەتی یانزە ساڵ و یانزەمانگ و هەژدەرۆژ بوو. پێغەمبەر (درودی خودای لە سەر بێت ) لەبارەی گەوریی حەزرەتی عوثمانەوە دەفەرموێت( لكل نبي رفيق في الجنة ورفيقي فيها عثمان ) رواه الترمذي ، لەبەهەشتدا بۆ هەموو پێغەمبەرێك هاوەلێك هەیە وەهاوەلی من تیایدا عوثمانە .

( **ثم علي المرتضى رضي الله عنهم** ) لەپاشا حەزرتی عەلییە کە پێغەمبەر (درودی خودای لە سەر بێت ) لەکاری دین و دونیادا رازی بووە لێ ی باوکی ناوی عبدولمەنافە کونیەکەی ئەبو حەسەنە , نازناوەکانی کەرارو حەیدەر وئەبی توراب‌ە کونیەی باوکی ئەبو تالیبە , لەبەر ئەوەی کورە گەورەی باوکی بووە ، شەهید بووە لەشەوی هەینی ٢١ رەمەزانی ساڵی ٤٠ ی کۆچی عبدالرحمن کوری مەلجەم شەهیدی کرد لەشەودا کاتێك لەماڵ دەچوو بۆ نوێژی بەیانی , تەمەنی ٦٣ ساڵ بوو .

**وخلافتهم على هذا الترتيب والخلافة ثلاثون سنة ثم بعدها ملك وإمارة**

---

ماوەی خەلافەتی چوار ساڵ ودەمانگ بوو , یەکەمین منداڵ بووە کەموسولمان بووە چەندەها بەڵگە هەیە لەسەر گەورەیی یەکێك لەوانە ئەوەبوو کەپێغەمبەر (درودی خودای لە سەر بێت ) حەزرەتی فاتیمەی لێ نیکاح کردووە .

( **وخلافتهم على هذا الترتيب** ) خلافەتیشیان لەسەر ئەو ڕێك وپێکیەیە, واتە: خەلافەت لەدوای پێغەمبەر (درودی خودای لە سەر بێت ) بۆ ئەبو بەکر لەپاشا بۆ عومەر , لە پاشا بۆ عوثمان و لەپاشا بۆ عەلی .

( **والخلافة ثلاثون سنة** ) خەلافەتی تەواو کامڵ لەدووای پێغەمبەر ۳۰ ساڵە چونکە ئەهلی حەل وعەقد لەئوممەتدا لەسەر ئەوەیەکن لەسەر خەلافەتی عەباسی و هەندێ مەروانی وەك عومەری کوری عبدالعزیز , مەبەست بەخەلافەت خەلافەتی تەواوە .

(**ثم بعدها ملك وإمارة** ) لەپاشا لەدوای ئەو سی ساڵە پاشایەتی و ئەمارەتە چونکە پێغەمبەر (درودی خودای لە سەر بێت ) دەفەرموێت (( الخلافة بعدي ثلاثون سنة ثم تصير ملكا عضوضاً )) رواه أحمد والترمذي وابو داوود .

واتە : خەلافەت لەدوای من سی ساڵە پاشان دەبێت بەپاشای و میر نشینی کەهەندێکیان ستەم لەهەندێکیان دەکەن . پێویستە لەسەر خەڵکی کەئیمامێك دابنێن .

چونکە پێغەمبەر (درودی خودای لە سەر بێت ) دەفەرموێت ( من مات ولم يعرف إمام زمانه مات ميته جاهلية ) شرح العقائد النسفية

٢٣٢: . واته: هەركەس بمرێت و ئیمامی زەمانی خۆی نەناسێت ئەوە بەمردنێكی نەفامی مردووە .

لەبەر ئەوەی ئوممەتی ئیسلام دانانی ئیمامیان بەگرنگترین شت دانا لەپاش كۆچی پێغەمبەر هەتا دانانی ئیمامیان پێش خست بەسەر كفن و شاردنەوەی پێغەمبەردا .

**والمسلمون لابد لهم من إمام يقوم بتنفيذ أحكامهم , وإقامة حدودهم , وسد ثغورهم , وتجهيز جيوشهم , وأخذ صدقاتهم , وقهر المتغلبة والمتلصصة , وقطاع الطريق, وإقامة الجمع والأعياد , وقطع المنازعات بين العباد و قبول الشهادة القائمة على الحقوق , وتزويج الصغار, والصغائر والكبارالذين لا أولياء لهم , وقسمة الغنائم**

---

هەروەها لەدوای كۆچ كردنی هەموو ئیمامێك ,لەبەر ئەوەی زۆربەی واجباتی شەرعی دەوەستێت لەسەر (ئیمام ) پێشەوا وەك دانەر دەفەموێت :( **والمسلمون لابد لهم من إمام** ) موسولمانان پێویستە ئیمامیان ببێت .

ئیمام : خەلیفەیە بۆ هەموو وولاتی موسولمانان . ( **يقوم بتنفيذ أحكامهم** ) بۆ ئەوەی هەستێت بەجێ بەجێ كردنی حوكمەكانیان ( **وإقامة حدودهم** )پیادەكردنی حودودە شەرعیەكانیان ( **وسدّ ثغورهم** ) وەرگرتنی كەلێنی موسولمانان تا دوژمن نەتوانێت بێتە ناو وولاتی ئیسلام .

( **وتجهيز جيوشهم** ) ئامادەكردنی سوپایان ( **وأخذ صدقاتهم** ) وەرگرتنی زەكاتیان ( **وقهر المتغلبة** ) زال بوون بەسەر ئەو كەسانەی كەیاخین ( **والمتلصصة** ) ئەوكەسانەی دزی دەكەن ( **وقطاع الطريق**) ئەو كەسانەی ریگرن .

( **وإقامة الجمع والأعياد** ) پیادەكردنی نویژەكانی هەینی و جەژن بەجەماعەت( **وقطع المنازعات الواقعة بين العباد** ) كۆتایی هێنانی ئەو كیشانەی كەپەیدا دەبن لەنیوان بەندەكاندا ( **وقبول الشهادةالقائمة على الحقوق** ) وەرگرتنی ئەو شایەتیانەی لەسەر مافەكانن .

( **وتزويج الصغار والصغائر** ) ژن نیكاح كردن بۆ ئەو كورانەی كەبچوكن و دان بەشوی ئەو كچانەی كەمندالن ( **والكبائر** ) ئەو كچانەی كەگەورەن و( **لا أولياء لهم** ) وەلییان نییە ، واتە سەرپەرشیاریان نیە ( **وقسمة الغنائم** ) دابەش كردنی تالانیەكان واتە :دەسكەوت .

**ثم ينبغي أن يكون الأمام ظاهراً لا مختفياً ولا منتظراً . ويكون من قريش ولا يجوز من غيرهم . ولا يختص ببني هاشم وأولاد على رضي الله عنهم , ولايشترط أن يكون معصوما ولاأن يكون أفضل أهل زمانهم, ويشترط أن يكون من أهل الولاية الكاملة , وسائسا قادراً على تنفيذ الآحكام , وحفظ الحدود الآسلام وإنصاف المظلوم من الظالم ولاينعزل الإمام بالفسق والجور .**

---

( **ثم ينبغي أن يكون الآمام ظاهراً** ) لەپاشا ئیمامی موسولمانان پێویستە ئاشکرابێت , بۆ ئەوەی خەڵکی موراجەعەی بکەن و ئەویش هەلبسێت بەرێك و پێك کردنی ئەمری دین و دونیا کەئیمام بۆ ئەوە دانراوە ( **لا مختفياً** ) پەنهان نەبێت لەترسی دوژمن ( **ولا منتظراً** ) نابێت چاوەڕێ بکرێت بۆ دەرکەوتنی لەکاتی چاکبوونی زەماندا ( **ويكون من قريش** ) دەبێت ئەو ئیمامە لەقورەیش بێت .

( **ولا يجوز من غيرهم** ) دروست نیە لەغەیری قورەیش بێت ( **ولا يختص ببني هاشم وأولاد علي رضي الله عنهم** ) تایبەت نیە بەبەنی هاشم و ئەولادی حەزرەتی عەلی یە وە خوایان لیَ رازی بێت . پێغەمبەر (درودی خودای لە سەر بێت ) **دەفەرموێت** ( ألأئمة من قريش) أخرجه أحمد ئیمامەکان لەقورەیش دەبن ( **ولايشترط أن يكون معصوما** ) بەمەرج نەگیراوە لەئیمامدا کەدەبێت بیَ گوناهبێت ( **ولاأن يكون أفضل أهل زمانه** )مەرج نیە ئیمام بەرێزترین بێت لەئەهلی زەمانی خۆیدا .

( **ويشترط أن يكون من أهل الولاية الكاملة** ) بەمەرج گیراوە ئیمام دەبێت لەئەهلی ویلایەتی تەواوبێت واتە : موسولمان و ئازادو ژیرو بالَغ بێت , وەجومهور فەرموویانە : ئیمام دەبێت موجتەهید بێت لەئوصول و فروع دا ( **وسائسا**) خاوەنی تەسەڕوفات بێت لەئومورو بەرژەوەندی زۆربەی خەڵکدا واتە لێزان بێت لەکارو باردا ( **قادراً**) بەتوانا بێت

لەرووی زانیاری وداد پەروەری و سەرپەرشتیکاری خەڵکی و ئازایەتیدا ( على تنفيذ الآحكام )بەسەر پیادەکردنی حوکمەکان .

( وحفظ حدود دارِ الأسلام ) پاراستنی سنوری وولاّتی ئیسلام (وانصاف المظلوم من الظالم )رزگار کردنی ستەم لێکراو لەستەم کار ( ولاينعزل ألإمامُ بالفسق والجور )پێشەوای موسولمانان لەکار ناخرێت بەهۆی دەرچوونی لەگوێرایەڵی خوداو ستەم کردن لەبەندەکانی خودا .

# کۆتایی

**لەباسکردنی چەند ئەمرێکی فەرعی کە ئەهلی سوننەو جەماعەت جیا دەبێتەوە پێی ئەمانەی لەخۆ گرتووە :**

١- دروستی نوێژ لەدوای پیاوی چاك و خراپ . وەدروستی نوێژیش لەسەریان ( جنازە )

٢- ریزگرتن لەهاوەلانی پێغەمبەر (درودی خودای لە سەر بێت ) و جنێونەدان پێیان .

٣- دروستی مەسح بەسەر کالادا.

٤- حەلالیەتی نەبیز لەقاپی عەرەقدا.

٥- بەردەوامی روو لێنانی خودا لەموسولمانان

٦- دەقەکان دەخرێنە سەر زاهیریان و ڕوونکردنەوەی کوفرەکان

٧- سوود وەرگرتنی مردوو لەنزاو چاکەکانی زیندوو وسودی نزا

**٨- نیشانەکانی قیامەت**

**٩- موجتەهید هەڵە دەکات و دەی پیٚ کێت .**

**١٠- رێز و گەورەیی لەنێوانی ئادەمیزاد و فریشتەدا.**

## وتجوز الصلاة خلف كل بر وفاجر و نصلي على كل بـر و فـاجر , ونكف عن ذكر الصحابة إلا بخير

---

( **وتجـوز الـصلاة خلـف كـل بـر وفـاجر** ) دروسـتە نوێـژکردن لـەدوای هـەموو ئینـسانێکی چاك وخـراپ , پیـاو خراپـە کـە مـادام گوناهەکـەی نەیگەیاندبێتـە کـوفر , خـۆ ئەگـەر گوناهەکـەی گەیانـد بێتـە کـوفر ئـەوە دروست نیە نوێژ کردن لەدوایەوە .

پێغەمبـەر ( دروودی خودای لە سەر بێت ) دەفـەرموێت ( صـلوا خلـف كـل بـر وفاجر وعلـى كـل بـر وفـاجر ) رواه الطبرانـي واتـە: نوێژبکـەن لـەدوای هەموو ئینسانێکی چاك وخراپ وەنوێژبکەن لەسەر هـەموو ئینـسانێکی چاك و خراپ .

وەلەبەر ئەوەی زاناکان نوێژیان کردووە لەدوای ئینسانی فاسقەوە . ئـەوەی نـەقل کـراوە لەهەنـدێك سـەلەف صـالحەوە لەقەدغـەکردنی نوێـژ لەدوای ئینسانی فاسق و ئەهلی بیدعەوە ئەوە خراوە تەسەر کەراهیەت , بەلام ئەگەر فیسق و بیدعەکەی دەیبر بۆ کوفر ئەوە نوێژکردن دروست نیە لەدوایەوە.

( ونـصلي علـى كـل بـر وفـاجر ) ئێمه نوێـژ دەكەین لەسەر هەموو ئینسانێكی چاك و خراپ ئەگەر لەسەر ئیمان مرد بێت لەبەر ئیجماع و فەرموودەی پێغەمبەر (درودی خودای لە سەر بێت ) ( لاتدعوا الصلاة على من مات من أهل القبلة ) أخرجه الطبراني فـي الكبير من حديث ابن عمر بسند رواه بلفـظ صـلواعلى مـن قـال لا إلــه إلاالله ، واتـه: وازمـەهێنن لـە نوێژكردن لەسەر كەسێك مردبێت و لەئەهلی قیبلە بێت .

( ونكف عن ذكر الصحابة إلا بخير ) ئێمە لەباسكردنی هاوەڵەكانی پێغەمبەر (درودی خودای لە سەر بێت ) خۆمان دەگرین مەگەر بەچاكە ، پێغەمبەر (درودی خودای لە سەر بێت ) دەفـەرموێت( لاتـسبوا أصـحابي فلـو أن أحـدكم أنفق مثل احد مابلغ مد أحدهم ولا نصيفه ) رواه إلا ربعة ، واته :بەهاوەڵەكانم جنێو مەدەن , ئەگەر یەكێك لەئێوە بە وێنـەی كێوی ئوحود خێـر بكات ناگات بەمشتێك شت كە ئەوان كرد بێتیان بەخێر وەبەنیوەیشیان ناگات. هـەروەها پێغەمبـەر (درودی خودای لە سەر بێت ) دەفـەرموێت(أكرمـوا أصـحابي فـانهم خيـاركم ) , رواه أحمـد و الحـاكم ، واتـە لەهاوەڵـەكانم رێـز بگـرن بەراستی ئەوان چاكترینتانن.[٩٠]

**ونشهد بـالجنة للعشرة الذين بشرهم رسـول الله (صلى الله عليـه وسلم ) بالجنة . ولا نشهد بـالجنة أو النـار لأحـد بعينـه , ونـرى المـسح على الخفين في السفر والحضر**

---

(ونشهد بـالجنة للعـشرة الـذين بـشرهم رسـول الله (صلى الله عليـه وسلم ) بـالجنـة )ئێمـە شـایەتی چـونە بەهەشـت دەدەیـن بـۆ ئـەو كەسـانەی كـە

---

(١٣٨) : شرح العقائد النسفية:٢٤٢ وشرح النسفية:٢٢٨ .

**پێغەمبەر** ( دروودی خودای لە سەر بێت ) **مژدەی بەهەشتی پێ داون , پێغەمبەر** ( دروودی خودای لە سەر بێت ) **دەفەرموێت** ( أبو بكر في الجنة , وعمر في الجنة ، سعد بن أبي وقاص في الجنة ,وسعد بن زيد في الجنة , و أبو عبيده بن الجراح في الجنة ) رواه الترمذي . **وەك ریوایەت كراوە كە پێغەمبەر** ( دروودی خودای لە سەر بێت ) **فەرمووی بەفاتیمە** ( ألاترضين أن تكوني سيدة نساء أهل الجنة أو نساء أهل الجنة أونساء المؤمنين ) رواه الترمذي . **واتە :**

**ئایا رازی نابیت كەسەیید وگەورەی ژنانی بەهەشت بیت یا گەورەی ژنانی ئیماندار بیت .هەروەها دەفەرموێت** ( أن الحسن والحسين سيدا شباب أهل الجنة ) رواه الترمذي ، **واتە :بەراستی حەسەن وحوسەین سەیید وگەورەی گەنجانی ئەهلی بەهەشتن .**

( **ولا نشهد بالجنة أو النار لأحد بعينه** ) **ئێمە شایەتی نادەین بۆ هیچ كەسێك بەشەخصی جگە هاوری كانی پێغەمبەر بەبەهەشت یا بەئاگری دوزەخ .**

( **ونرى المسح على الخفين في السفر والحضر** ) **ئێمە دەبینین ودەڵێین بەدروستی مەسح كردن لەسەر كالا (خف) لە كۆچ كردن و دانیشتندا .حەزرەتی عەلی فەرمووی** ( جعل رسول الله ( **صلى الله عليه وسلم** ) ثلاثة أيام ولياليهن للمسافر ويوما وليلة للمقيم ) البخاري ,**واتە: پێغەمبەر**( دروودی خودای لە سەر بێت ) **بڕیاری داوەسێ رۆژ بەشەوەكانیەوە بۆكۆچەری و رۆژو شەوێك بۆدانیشتوو كەمەسحی كاڵە بكەن .**

**شیخ حەسەنی بەصری** ( رەحمەتی خودای لە سەر بێت ) **دەفەرموێت** ( أدركت سبعين نفرا من الصحابة يرون المسح على الخفين) **واتە :**

**گەیشتوم بەخزمەت حەفتا كەس لەهاوەڵەكانی پێغەمبەر** ( دروودی خودای لە سەر

بێت) بەلایانەوە دروست بووە مەسح کردن لەسەر کالا . ئیمامی ئەبو حەنیفە دەفەرموێت ( ما قلت بالمسح حتى جائني فيه دليل مثل ضوء الشمس ) هیچم نەوتووە لەبارەی دروستی مەسح هەتا بەڵگە یەکەم بۆ هات وەك رووناکی خۆر بوو.[91]

**ولا نحرم نبيذ الجرة , ولايبلغ ولي درجة الأنبياء , ولايصل العبد إلى حيث يسقط عنه الأمر والنهي . والنصوص تحمل على ظواهرها .والعدول عنها الى معان يدعيها أهل الباطن: الحاد وكفر ,ورد النصوص كفر ,وإستحلال المعصية كفر ,إذا ثبت كونها معصية بدليل قطعي , والاستهانة بها كفر , والاستهزاء على الشريعة كفر**

---

(**ولا نحرم نبيذ الجرة**) ئێمە حەرامی ناکەین جەرە , نەبیز خورمایەیا مێوژە دەیکەیتە ناو ئاوە وە لەزەتێك پەیدا دەکات لەدوای ئەوەی دووسێ یەکی دەروات بەکولان . وەجەرەش قاپی عارەقە کەدروست دەکرێت لەقوڕی برژاو .

(**ولايبلغ ولي درجة الأبنياء**) دوستی خودا(ولی) ناگاتە پلەی پێغەمبەران لەبەر ئەوەی پێغەمبەران بێ گوناهن ئەمینن لەترسی خاتیمە و رێز لێگیراون بەوەحی و بینینی فریشتە و ئەمر پێ کراون بەگەیاندنی ئەحکامی شەرعی ورێنومای خەڵکی لەپاش ئەوەی وەصف دارن بەتەواویەتی ئەولیاوە .

---

(١٣٩) : شرح العقائد النسفية :٢١٤, ٢٤٥ .

( **ولايصل العبد الى حيث يسقط عنه الأمر والنهي** ) پلیەیەکی وانیە بەندە پێ ی بگات ئەمر و نەهی بەجێ نەهێنێت مادام ژیرو بالغ بێت .

( **والنصوص تحمل على ظواهرها** ) دەقەکان کیتاب وسوننە دەخرێنە سەر مانای ئاشکرا کەیان مادام بەڵگەیەکی قەطعی نەبێت لایبدات .

( **والعدول عنها الى معان يدعيها أهل الباطن** )لادان لەو مانا ئاشکرایە بۆ چەند مانایەکی تر کەئیدیعای دەکەن ئەهلی باتین ( **الحاد وكفر** )ئەوە لادانە لەبیرو باوەڕی ئیسلام وکوفرە .

( **ورد النصوص كفر** )بەر پەرچدانەوەی دەقەکان کوفرە بەم شێوەکە ئینکاری ئەو حوکمانە بکات کە دەقی قەطعي لەسەر بێت کیتاب وسوننە وەك حەشر کردنی لاشە ئەوە کوفرە .

( **وإستحلال المعصية كفر** )بەحەلال زانینی گوناە گەورە بێت یابچوك کوفرە ( **إذا ثبت كونها معصية بدليل قطعي** ) کاتێك ئەو گوناهە چەسپا بێت ، بەبەڵگەی قەطعی .

( **والاستهانة بها كفر** )بەسوك وبێ نرخ دانانی گوناە کوفرە ( **والاستهزاء على الشريعة كفر** ) گاڵتە کردن لەسەر شەریعەت و وابزانێت کەکارێکی بێ رێزە کوفرە .

**واليأس من الله تعالى كفر والأمن من مكر الله تعالىكفر , وتصديق الكاهن بما يخبر به عن الغيب كفر**

( **واليأس من الله تعالى كفر** ) بێ ئومێدی لەرەحم و بەزەیی خوا کوفرە چونکە ﴿ لاييأس من روح الله إلا القوم الكافرون ﴾ يوسف ۷۸: .واتە لەرحمەتی خودا نائومێد نابێت مەگەر ئەوانە کە کافرو بێ باوەڕن زیانکاری دنیاو قیامەتن.

( **والأمن من مكر الله تعالىكفر** )ئەمین بوون لەمەکرو سزای خودا کوفرە وەك ئەوەی بڵێن و خودا سزا نادات و تۆڵە لەبەندەیەك لەبەندەکانی ناسێنێ .

( **وتصديق الكاهن بما يخبر به عن الغيب كفر** ) بەراست زانینی فاڵچی بەوەی هەواڵ دەدات لەغەیب کوفرە لەبەر ئەوەی پێغەمبەر (دروودی خودای لە سەر بێت ) دەفەرموێت : ( من أتى كاهنا فصدقه بما يقول فقد كفر بما أنزل الله على محمد (صلى الله عليه وسلم) ) رواه أحمد .

واتە: هەرکەس برواتە لای فاڵچییەك بەراستی بزانێت ئەوەی دەیڵێت ئەوە باوەڕی نیە بەوەی کەخودا رەوانەی کردووەتە سەر موحەمەد .

پێغەمبەر (دروودی خودای لە سەر بێت ) دەفەرموێت ( من أتي عرافا فسألهُ عن شيئ لم تقبل لة صلاه أربعين ليلة ) رواه المسلم . واتە : هەرکەسێ بچێتە لای فالچییەك و لەبارەی شتێکەوە پرسیاری لێ کرد ئەوە چل شەو نوێژی لێ وەرناگیرێ .

کاهن : بەکەسێك دەووترێت کەخەبەر دەدات لەهەندێك شتی پەنهانی کەروو دەدات لەداهاتوو ,وەرای دەگەیەنێت کەغەیب دەزانێت ,

وەلەهەندێك كاتدافسەی راست دەردەچێت , وەگومان دەبات كەجنۆكە خەبەری دەداتیٚ .

وەمامۆستا مەلا عبدالكريم دەفەرموێت:

( كـاهن ) كەسێكـەخــاوەن ریـاضــەت خـۆی ئـازار ئـەدا بـیٚ رێـی شەریعەت

ئەم نەوعـە كەسێكە ( ضـال ) و گومرایـە لـە ئاسمانـا بـیٚ لـە نـاو چـالایە

**والمعدوم ليس بشيئ وفي دعاء الآحياء للآموات . وصدقتهم عـنهم نفع لهم**

---

( **والمعدوم ليس بشيئ** ) نەبوو هیچ نیە ، مەعدوم دوو جۆرە :

جۆری یەكەم : مەحاڵە بوونی وەك هاوەڵ دانان بۆ خودا .

جۆری دووەم : دەگونجیٚ بون و نەبوونی وەك كوڕی زەید كەهێشتا لەدایك نەبووبیٚ .

( **وفي دعاء الآحياء للأموات ، وصدقتهم عنهم** ) لـەنزای زینـدوودا بـۆ مردوو وە خێركردن بۆیان ( **نفـع لهـم** ) سـودەبۆ مردووەكان پێغەمبـەر ( دروودی خـودای لـە سەر بێت ) دەفـەرموێت : ( مـامن میـت یـصلي عليـه امـة مـن المسلمين يبلغون مائة يشفعون له إلا شفعوا فيه ) رواه مسلم . واتە: هیچ مردوویەكی موسولمان نیە كەكۆمەڵێك موسولمان نوێـژی لەسـەر بكـەن

وەئەو کۆمەڵەیە ژمارەیان بگاتە سەد هەموویان تکای بۆ بکەن ئیلا خودا تکاکەیان لیّ وەردەگریّت بۆ مردووەکە..

هەروەها پێغەمبەر (درودی خودای لە سەر بێت) عادەتی وابوو هەرکاتێك لیّ بوونایەتەوە لەشاردنەوەی مردوو دەوەستا لەسەر ی و دەیفەرموو ( إستغفروا لأخيكم وسلوا له التثبيت فإنه الآن يسال ) رواه أبو داود واتە: داوای لێخۆشبوون بۆ براکەتان بکەن وەداوای ثابت بوونی وەڵامەکەی بۆ بکەن بەراستی ئێستا پرسیاری لیّ دەکریّ .

دەگێرنەوە لەحەزرەتی عائیشەوە کەپیاوێك هات بۆ خزمەت پێغەمبەر (درودی خودای لە سەر بێت) : وتی ( يارسول الله إن أمي أفتلنت نفسها ولم توص وأظنها لو تكلمت تصدقت . أفلها أجر إن تصدقت عنها ؟قال :نعم ) رواه البخاري والنسائي . واتە: ئەی پێغەمبەری خودا(درودی خودای لە سەر بێت) دایکم گیانی کتوپڕ دەرچووە وەسیەتی نەکردووە گومان دەبەم ئەگەر بگەیشتمایە بەقسەکردنیاخێری دەکرد , ئایا خێری بۆ بکەم پاداشتی بۆ هەیە ؟ فەرمووی بەلّی .

پێغەمبەر (درودی خودای لە سەر بێت) دەفەرمویّت :( من مات وعليه صيام صام عنه وليه ) رواه البخاري , هەرکەس مردوو رۆژوی بەسەرەوەبوو ئەو کەسەی سەرپەرشتی دەکات بۆی بگێرێتەوە .

**والله تعالى يجيب الدعوات و يقضي الحاجات وما أخبر به النبي (صلى الله عليه وسلم) من أشراط الساعة من خروج الدجال , ودابة الأرض**

---

( **والله تعالىيجيب الدعوات ويقضي الحاجات** ) **خوداى تەعالا نزاكان وەردەگريت وەپيويستيەكان جىْ بەجىْ دەكات .**

**لەبەر ئەوەى خودا دەفەرمويت** :﴿ أدعوني أستجب لكم ﴾المؤمن : ٦٧ .**واتە: ئيوەمن بانگ بكەن و منيش بەدەنگتانەوە ديم .**

**وەپيغەمبەر** (درودى خوداى لە سەر بيت) **دەفەرمويت** :( يستجاب للعبد مالم يدع بإثم أو قطيعة رحم وما لم يستعجل ) رواه مسلم :**واتە : نزاى بەندە وەردەگيريت مادام داواى گوناه نەكات يا خزمايەتى بپچريت و پەلەنەكات .**

( **وما أخبر بە النبي** (صلى الله عليه وسلم) **من أشراط الساعة** ) **ئەو هەوالەى پيغەمبەر** (درودى خوداى لە سەر بيت) **داويەتى لەنيشانەكانى قيامەت ( من خروج الدجال ) لەدەر چونى دەجال ماناكەى واتە زۆر درۆزن . وەمەبەست ئەو پياوەيە كەپيغەمبەر** (درودى خوداى لە سەر بيت) **هەوالى داوە لەبارەيەوە كە لە ئاخر زەمان دەردەكەويت بۆ گومراكردنى خەلكى.**

( **ودابة الأرض** ) **وەدابەتول ئەرز خودا دەفەمويت** :﴿ وإذا وقع القول عليهم أخرجنا لهم دابة من الأرض تكلمهم أن الناس كانوا بأياتنا لايوقنون ﴾ النمل : ٨٢ . **كاتيك فەرمانى سزادان و قارى خودا هاتە سەر ئەو كافرانە .**

**ئەو لەو كاتەدا لەزەوى صەفادا لەنزيكى كەعبە حەيوانيك دەردەكەين , كەبەفەرمانى ئيمە ديتە زمان و قسەدەكات لەگەل خەلكەكەدا كە ئادەميزادى ئەو رۆژە لەوانەبوون كە يەقين و باوەريان بەوشتانە نيە كەبەياساى** ( خرق العادة) **پەيدا دەبن .**

ترمذي ريوايەتی کردووه لەئەبوو هورەيرەوه کەپێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت) فەرموويەتی کۆمەڵێك دادەنیشن لەسەر سفەرەی خواردن و وادەڵێن بەيەکتر واتە لەنزیکی واقیع بوونی قیامەتدا حەیوانێك لەزەوی صەفا دەردەچێت کە لەریوایەتێك دا هەیە شەست گەز درێژە ئەو حەیوانە خودا کردوویە بەنشانەیەك بۆ جیاکردنەوەی موسولمان و کافر لەزەویدا بەو عەصایە وابەدەستیەوە دەدات لەناوچەوانی موسولمان و سپی وروناکی دەکاتەوە و دەردەکەوێت کەموسولمانە و, دەدات لەناوچەوانی کافر یا لەسەر لوتی وەکو داخ رەشی دەکاتەوە بەجۆرێك کاتیٚ کۆمەڵێك

**ويأجوج وماجوج , ونزول عيسي عليه السلام , وطلوع الشمس من مغربها حق**

---

لەو خەڵکە لەسەر خوانیٚ دادەنیشن بۆ نان خواردن دەردەکەوێت کامیان موسولمانە وکامیان کافرە , یەکێك بەعادەت تیکەیەك یان میوەیەك دەدات بەدەستی یەکێکەوە و دەلێت وەری بگرە ئەی موسولمان , یا دەیدات بەکافرەکەو دەڵێت ئەی کافر وەری بگرە ....وەبەو جۆرە بانگ دەکەن لەیەك . واتە لەبەر چاوی خەڵکی دنیادا راستی دەردەکەوێت . تەفسیری نامی ٥ / ٤٧٨و ٤٧٩ .

( **ويأجوج وماجوج** ) یەئجوج و مەئجوج دووپیاون لەئەولادی یافث ی کوڕی نوح نەتەوەیان زۆرە وە نەتەوەکەیان ناونراون بەوە لەبە زۆریان لەبەر ئەوەی هەندێکیان دەڕۆن بەسەر هەندێکیاندا.( **ونزول عيسى عليه**

الـصلاة و الـسلام ) دابـەزینی حـەزرەتی عیـسا لـەئاسمان بـۆ سـەر رووی زەوی .

( **وطلوع الشمس من مغربها** ) هـەلهاتنی خـۆر لـە خـۆر ئـاواوە ( حـق ) ئەمانـە باسمـان كـردن راسـت و حـەقن . حوزەیفـەی كـوری ئەسـەدی غیفـاری دەفـەرموێت ، پێغەمبـەر (درودی خـودای لـە سـەر بێـت ) تەشـریفی هـات بەسەرماندا ئێمە باسی قیامەتمان دەكرد فەرمووی:باسـی چـی دەكـەن ؟ وتیـان :باسـی قیامـەت دەكـەین :فـەرمووی : بەراسـتی رۆژی قیامـەت هەڵناسێت تا پێش قیامەت دە نیشانە نەبینن :

(١) دۆكەڵێك .

(٢) دەجال

(٣) داببە

(٤) هەڵهاتنی خۆر لەخۆرئاوا

(٥) ودابەزینی حەزرەتی عیسا

(٦) یەئجوج و مەئجوج

(٧) رۆچونێك لەرۆژهەلات

(٨) رۆچونێك لەرۆژئاوا

(٩) رۆچونێك لەنێو دورگەی عەرەب

(١٠) وەكۆتایی ئەمـە ئاگرێكە لـەخاكی یەمـەن دەكەوێتـەوەو خـەڵك راپێچ دەكات بەرەو مەحشەر) ، رواه مسلم .

**والمجتهد قد يخطئ وقد يصيب**

(والمجتهد قد يخطئ وقد يصيب) موجتەهید کەم جارێك هەڵەدەکات لە ئیجتیهاددا وەکەم جارێکیش دەیپێکێت .موجتەهید : بەو کەسە دەوترێت مەرجەکانی ئیجتیهادی تێدا بێتە دی و وەئەوشتەی زانایانی ئوسولی فیقە بریاریان داوە لەسەری.

**مەرجەکانی موجتەهید :**

١- دەبێت بالغ بێت .

٢- دەبێت ژیربێت یانی خاوەنی هێزێکی چەسپاو بێت لەنەفسیدا هەستی پیٚ بکات بەو هێزەشتی زانراو.

٣- دەبێت زانابێت بەبەڵگەی عەقڵی وچۆنیەتی بەڵگە پیٚ ی .

٤- دەبێت تێگەشتنی چاکی هەبێت لەمەبەستی قسەدا .

٥- دەبێت زمانی عەرەبی بزانێت لەبارەی (لغة )و(نحو)و ( صرف) و(بلاغة) .

٦- دەبێت ئاگای لەو حوکمانە بێت کە ئیجماعی زانایانی شەرعیان لەسەر هەیە و جیا یان بکاتەوە لەو حوکمانەی کەجێگای جیاوازی زانایانە تیایدا.

٧- دەبێت جۆرەکانی قیاس بزانێت وەك جەلی وموساوی و ئەدوەن .

**٨- دەبێـت ئاگـای لـەو ئایـەت و حەدیـسانە بێـت کەپەیوەنـدیان بەئەحکامی ئیسلامەوەیە.**

**٩- دەبێـت (عــام ) و (خــاص) (ومجمــل)و(مبــيِّن) و(ناســخ) و(منــسوخ) و(متــشابە) و(محکـم) وهـۆی هاتنـەخوارەوەی ئایەتـەکان بزانێت .**

**١٠ - دەبێت شارەزابێت بە حەدیسی (آحاد ) و (متواتر) و (متصل ) و (مرسل ) و (صحیح ) و (ضعیف ) و ئاگای لە حاڵی ئەوانە بێت کە حەدیسەکانیان گێراوەتەوە ئاخۆ بەهێزن یابێ هێزن .**

**پێغەمبەر** (دروودی خودای لە سەر بێت ) **دەفەرموێت** ( إذا حكم الحـاكم فأصـاب فله اجران ,وإن حكم فاجتهد ثم أخطأ فله أجر واحد) رواه مسلم .واتـه :

**کاتێك حاکمێك حوکمی کرد و پێکای ئەوە دوو پاداشتی بۆ هەیە ئەگەر حوکمی کرد و ئیجتیهادی کرد لەپاشا هەڵەی کرد ئەوەیەك پاداشتی بۆ هەیە .**

ورسل البشر ـ أفضل من رسل الملائكة

ورسل الملائكة ـ أفضل من عامة البشر

وعامة البشر ـ افضل من عامة الملائكة

---

**(ورسـل البـشر - أفـضل مـن رسـل الملائكـة)** پێغەمبـەرانی (رسـل) ئـادەمیزاد بـەرێزترن لەپـەیام نێرانـی فریـشتە کـەجبریل و ئیـسرافیل وعیزرائیل و میکائیلە .

**(ورسل الملائکـة - أفـضل من عـامـة البـشر)** پەیام نێرانی فریشتە بەرێزترن لەئادەمیزاد بەگشتی .

**(وعـامة البشر - افضل من عـامة الملائکـة)** کۆی ئادەمیزاد بـەرێزترن لەکۆی فریشتە بەڵگەش لەسەر ئەوەی کۆی ئادەمیزاد بەرێزترن لـەکۆی فریشتە ئەمانەی خوارەوەیە :

١- خوا ئەمری کرد بەفریـشتە کـەکورنوش ببـەن بـۆ ئـادەم لـەڕووی گەورەیی وڕێزیەوە کورنوش لەنزمەوە بۆ بەرز دەبێت

٢- خـودا دەفـەرموێت ( وعلـم أدم الأسـماء کلهـا )فێرکردنـی ئـادەم بەڵگەیە لەسەر ئەوەی گەورەترە لەفریشتە .

٣- خـودا دەفـەرموێت ﴿ ولقـد کرمنـا بنـي أدم وحملنـا هـم فـي البـر والبحر وفضلنا هم علی کثیر ممن خلقنا تفضیلا ﴾ الاسـراء :٧٠ واتـە: بەراسـتی ئێمـە کەرامـەت و پایـەمان دا بـەئادەمیزاد , وەهـەلمان گـرتن لەووشـکان و دەریـا وە لەهـەموو ژیـوارێکی دلخـوازی باشمـان دانـیٚ و پایەمان پێدان بەسەر زۆر گەلی لەوانەدا کە دروستمان کردوون بەگەورە کردنێکی باش .

لـێ بوومـەوە لەنوسـینی ئـەم کتێبـە پـیرۆزە سـەر لەبـەیانی رۆژی یەکشەممە بـەرواری ٣ ی موحـەڕەمی ساڵی ١٤٢٣ کۆچی بەرامبـەر ١٧ /٣/ ٢٠٠٢ لەهەلەبجـەی شـەهید خوایـە لێمـان وەرگـرەو سـەرکەوتومان بکە لەکاری دین و دونیا بێ حورمەت و رسوای دنیاو قیامەتمان مەکە

وصلى الله على سيدنا محمد واله وصحبه وسلم واخر دعوانا ان الحمـد لله رب العالمين.

# سەرچاوەکان

١- القرآن الكريم

٢- اصول الدين الاسلامي د. رشدي عليان وقحطان عبدالرحمن الدوري

٣- نور الايمان عبدالكريم المدرس

٤- التاج الجامع للاصول في أحاديث الرسول منصور على ناصف

٥- شرح العقائد النسفية التفتازاني ( طبع حجري )

٦- شرح النسفية في العقيدة الاسلامية د: عبدالملك عبدالرحمن السعدي

٧- شرح رمضان افندي على شرح العقائد .

٨- الوسيلة في شرح الفضلية لسيد عبد الرحيم الملقب بالمولوي

٩-مەكتوبات كاك ئەحمەدی شێخ كاك ئەحمەدی شێخ

١٠ - سەچاوەی ئایین مامۆستا مەلا عبدالكريمی مدرس

١١ - عقيدە ی مرضيه        عبدالرحيم مەولەوی

١٢-تەفسيری نامی مامۆستا مەلا عبدالكَريمی مدرس

١٣- روونكردنەوەی العقيدة الطحاوية    مامۆستا عبدالله هەرتەلی

١٤- شەريعەتی ئيسلام      مامۆستا مەلا عبدالكريم المدرس .

زۆر سوپاسی ئەم مامۆستا بەرێزانە دەکەم کە پێداچوونەوەیان گرتووەتە ئەستۆی خۆیان وە داواکارم لەخودا کەتەمەن درێژ و سەرکەوتویان بکات لەکاروباری دین و دونیادا .

١- جەنابی مامۆستا شێخ نورالدینی مفتی .

٢- مامۆستا شیخ غەفوور ووتاربیژی خانەقای بیارەی شەریفە

٣- مامۆستا شێخ غازی نێرگسەجاری پێش نوێژو ووتاربێژی مزگەوتی شەهیدان لە هەڵەبجەی تازە .

٤- مامۆستا سەیید مەحموود تاوگۆزی پێش نوێژو ووتاربێژی مزگەوتی کانی ئاسکان لەزەراین.

٥- مامۆستا شێخ عیرفانی مامۆستا شێخ نورالدینی مفتی پێش نوێژ و وتار خوێنی مزگەوتی حاجی قەرەنی لە هەولێر .

# بۆ ئاگاداری

مژدە بۆ خوێنەران :

بەرهەمی نوێی نوسەر ( پرسیار و وەلام لە فیقهی ئیمامی شافیعیدا ) لە ژێر چاپدایە لە سێ بەرگدا



# دانەر لە چەند دێڕێکدا

عومەر کوڕی شێخ نورەدینی کوڕی شێخ مستەفای مفتی کوڕی شێخ محمودی قازی کوڕی شێخ عەبدڵای خەرپانی لە ساڵی ١٩٦٥ لە هەڵەبجەی شەهید لە بنەماڵەیەکی ئاین پەروەر لە دایك بووە .

خاوەنی بڕوانامەی زانستی یە کە لە خزمەت باوکیدا خوێندنی تەواو کرد ووە و بڕوانامەی وەرگرتووە .

دەرچووی ساڵی ١٩٨٨-١٩٨٩ ی زانکۆی بەغداد کۆلێژی شەریعەیە لە کۆلێژ بۆ ماوەی یەك ساڵ فەصل کرا لە بە هۆی نەکردنی (جیش الشعبی) دوو مانگ زیندانی بووە لە نوگرەسەلمان ئیمام و ختیبی مزگەوتی دارالسلامە لە هەڵبجەی شەهید و لێپرسراوی لیژنەی فەتوای لقی شارەزووری یەکێتی زانایانی ئایینی ئیسلامی کوردستانە.